# بەیان


گوڤارێکی ئەدەبیە، دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، مانگی جارێك بڵاوی دەکاتەوە.

ناونیشان : دارالثقافة والنشر الكردية

ساحة الخلاني - بغداد

تەلەفون : ٨٨٧٥٧٩٥ / ٥ هێڵ

سەرنووسەر

اسماعيل رسول احمد

بەڕێوەبەری نووسین

صلاح مصطفى جەلالی


## لەم ژمارەیەدا



لە بیرەوەری ی

سیازدەهەمین ساڵی شۆڕشی ١٧ - ٣٠ تەمووزدا

# شۆڕش لە بواری بنیات نانا

لەو رۆژەی کە شۆرشی پیرۆزی ١٧ - ٣٠ تەموزی ١٩٦٨ هەنگاوی یەکەمی هاویشتوەو موژدەی رزگارکردنی مرۆڤی ئەم وڵاتەی لەگەڵ خۆی هێناوە .. هەزاران هەزار کارو بوار لە بەردەم ئەم گەلە نەبەزەدا کراوەتەوە .. مزگێنی ژیانێکی نوێو مرۆڤێکی نوێی نێو نیشتمانێکی سەوزو نوێ سەری هەڵداوە .. رۆژ دوای رۆژیش کۆرەوی ئەم وڵاتە شیرینە ، بۆ هەواری بەرزیو بەختەوەری پێ هەڵنەگرێو قۆناغ ئەبرێ .

شۆرش لەم سیانزە بەهارەی تەمەنیو لە ئاستو ستراتیژیەتی بنیادنانو گەشەسەندنا ، گەلێ پلانو نەخشەی وردو زانستانەی لە هەموو بوارێکی ژیانی کۆمەڵایەتیو ئابوریو سیاسیو رۆشنبیریدا ، هەڵخستوە .. هەر لە سەرەتاوە هەوڵی چارەسەرکردنی برایانەو ئاشتیانەو دیموکراتیانەی مەسەلەی کوردی داوە .. گەلێ دەسکەوتی بۆ گەلی کورد هێناوەتە کایە ، کە لوتکەکەی گەیشتۆتە جاڕدانی قانونی ئۆتۆنۆمی کوردستانو راهێنانی بارێکی چاکی ژیان بۆ گەلی کورد ...

لە تەك ئەم دەسکەوتە مەزنەدا ، جاڕی خۆماڵی کردنی نەوتی نیشتمانی لە (١)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٧٢) داوە و روبەڕوی کۆمپانیا مۆنۆپۆلەکان بۆتەوەو ئەم سامانەی لە دەس بێگانە چاوچنۆکەکان دەرهێناوەو کردویەتی بە خەڵاتو بۆ گەلە نەبەردەکەمانی هێناوە .

• لە هەمان کاتا ، هەوڵێکی بنەڕەتیانەی داوە، بۆ گۆڕینی بنچینەی ئابوری ، کە تەك تەنیا بەندبێ بە سامانی نەوتەوە ، بەڵکو بەندبێ بە چەشنەها



سامانی کەی وەك کشتوکاڵو پیشەسازیەوە ..

بۆ ئەمەیشو لە دەرفەتی کشتوکاڵی هاوچەرخا گەلێ بنەمای زانستی رەخساندوە ؛ لەمانەیش دامەزراندنی کۆمەڵەی هەرەوەزی جوتیاران کە لە سەرەتای شۆرشدا . تەنیا ( ٤٧٣ ) کۆمەڵەبو . کەچی لە سەرەتای ئەمساڵەدا . گەیشتۆتە پتر لە (١٩٨٧) کۆمەڵەو

پتر لە (٣٥٥) هەزار ئەندامی تیدا کۆبۆتەوە .. پلانی داهاتووی ساڵانی ٨٠ – ١٩٨١ یش . خەریکە (٢.٤٥) هەزار دۆنمە زەوی لە سەرانسەری وڵاتا چاكبكاتەوە .

ئەمەو لە دەرفەتی پیشەسازیشدا . شۆرشی پیرۆزی ١٧ – ٣٠ تەموزی پێشکەوتنخواز . گەلێ دەسکەوتی فراوانی جێبەجێ کردودو هەوڵێکی بێشوماری داوە . تا چەندین گۆڕانی بنەڕەتیو جەوهەری . لە بنچینەو هەیکەڵی پیشەسازیا بێنێتەکایە ...

لە بواری کەرتی بازرگانیو لە پێناوی سەرفرازیو ئاسودەیی مرۆڤی ئەم نیشتمانە ئازیزەدا . شۆرشی پیرۆز قەڵەمبازێکی فراوانی لە دەرەتانی بازرگانیی دەرەوەدا ، داوەو لە

ناوەوەشدا . کەرتی ئیشتراکی دەورێکی گەورەو بایەخداری لە رێکخستنو گەشەسەندنو دابەشکردنا بینیوە ..

-

بەم شێوەیەو لە هەمو بوارو دەرەتانێکا ، لە بواری رۆشنبیرییا . لە بواری تەندروستیو پەروەردەی منداڵو هونەرا .. لە بواری رێگەوبانو پرۆژەی هەمەجۆرا . شۆرشی مەزنی ١٧ – ٣٠ تەموز . بە رابەرایەتی حیزبە دلێرەکەی . حیزبی .

بەعسی عەرەبی سۆشیالیست . لە بنیادنانو لە خولقاندنی ژیانێکی نوێی نێو نیشتمانێکی سەر بڵندو هاوچەرخدا . بەردەوامە .. لە پاڵ ئەوەش

گەلو سوپای دلێرمان بە سەرکردایەتی رۆڵـەی وەفاداری گەل ، ســـەرۆك صدام حسین ، لـــە رۆژی ئەمڕۆدا روبەڕوی دوژمنێکی گێلو گەوجی وەك رەگەزپەرستە فارســـــەکانو حوکمگێرە ســـــەرشێتەکانی قومو تاران بۆتەوە .. کەچی رەوتی بنیادنانو تـەوەرەی ژیـانێکی نوێی نێـو عیراقێکی هاوچەرخ هەر بەردەوامەو لە خولدان نـاوەســـتێ ، چونـکە خواســـتی گـــەلو ســـەرکردایەتیەکەی ، لەگـــەڵ مەنتیقی ژیـانو سەرهەڵداندایەو هیچ هێزێکی رەش نیە ، پێی بوێرێ .

**سلاو لە سەرۆکی فەرماندە**

**سلاو لە یادی ســـیانزە سالەی ژیـانو بنیادنـان**

**سلاو لە جەنگاوەرانی قادسیەی صدام .**

● عیراق زۆر بەتەنگ ئەوەوەیە پەیوەندییەکانی لەگەڵ وولاتانی جیهانی سێهەم بەرەو پێش بـــدات . بەتایبەتی وولاتە بێلایەنەکانو باوەڕی تەواوی بـــە بیروباوەڕی بێلایەنیو پێویستی پەرەپێدانـــــی بزووتنەوەی بێلایەنی هەیە لە پاڵ پەرەپێدانی هاوکاری نێوان هەموو ئەو وولاتانە لە رووی سیاسیو ئابووریو رۆشنبیرییەوەو کار لە پێناوی زیادکردنی تەئسیرو شوێنی دوودای ئەم بزووتنەوەیەدا دەکات . بـــەو جۆرەی کە حورمەتی کاروبارەکانی خـــەباتی دژی ئیستعمارو جیاوازی رەگەزایەتی دەکات . لەگـــەڵ وەستانی هەموو شێوە چەوساندنەوەو سیاسەتی حزبەبازیداو لە پێناوی [illegible] دەوڵەتاندا بەو جۆرەی مافە بنەڕەتییەکانـــــی وولاتانی جیهانی سێهەم زامن دەکات لە ســـەر بنەڕەتی هاوکـــاری وەك یەك .

سەرۆکی فەرماندە
صدام حسین





ڕێڕەوی شۆڕشی چەسپاوو ئاشکرا پتەو دەرکەوتووەو ، هەروەها گیانێکی بەرزی بە تواناییو ئازایەتی هەبووە بۆ شیکار بردنەسەر هەموو شتێکی سلبیی واقیع چی لە بواری سیاسیدا بێت یان لە بواری ئابووری یان کۆمەڵایەتی یان پەروەردەییدا ، بۆیە ئەنجام ، دەرەنجامێکی زۆری دەستکەوتی مێژوویی مەزنی لە ناوخۆی وڵاتدا وەدیهێنا ، کەسەنگێکی ئەوتۆو ڕێزلێ گرتنێکی ئەوتۆو کارتێکردنی ئەوتۆیان بە حزبو شۆڕش بەخشی چی لە مەیدانی عەرەبی چی لە مەیدانی نێو دەوڵەتیدا.

ئەوەی شۆڕش لە نێو خۆیدا وەدیهێنان شان بە شانی ئەو دەورەی بوون کە لە بواری نەتەوەییدا گێڕای و دەیگێڕێت ، چونکە لە بنەڕەتدا شۆڕشێکی نەتەوەیی سۆشیالیستییە ، عیراقی کردە بنکەیەکی سەربەخۆ بۆ تێکۆشانو جێگایەکی پێشەوە بۆ بزووتنەوەی شۆڕشی عەرەب ، لێرەوە بوو شۆڕشی بەرەو ڕووی پیلانەکانی دوژمنانو پرۆژەکانی سازاندنی خۆبەدەستەوەدان ڕاوەستاو ئازایانە دژی بیری بەزینی سەوداکردنانە تێکۆشاو ، بەسەربەرزییەوە بەرگری لە مەسەلەی نەتەوەییو لە سەربەرزیی نەتەوەو کەلەپوورو شارستانیەتو پاشەڕۆژی کردو دەکاتو دژی پەیمانی ئیمپریالیی زایۆنیو ڕێککەوتننامەکانی کامپ دیڤیدی خۆبەدەستەوەدانو پەیمانی ڕێککەوتنی نێوان زایۆنیو سادات ڕاوەستاو ڕادەوەستێت .

شۆڕش لە ماوەی سیازدە ساڵەی تەمەنیدا ، لەگەڵ پتربوونی ڕێڕەوی شۆڕشو بنیاتنانو گۆڕانکاریی پێشکەوتنخوازو سۆشیالیستی لە ناوخۆی وڵاتداو ، دەوری پێشەنگی نەتەوەییانەی لە تێکۆشان لە پێناوی وەدیهێنانی ئامانجەکانی نەتەوەو دوور خستنەوەی ئەو مەترسیانەی تووشیان دەبێتو ، بەرگریکردن لە بوونو دەسەڵاتو یەکێتیی ، ئەوە بوو شۆڕش ڕێگای تایبەتیو

پەیڕەوی چەسپاوی خۆی هەبوو لە سیاسەتی دەرەوەو مامەڵەکردنی نێو دەوڵەتیدا، دوور لە هەر ڕواڵەتێک لە ڕواڵەتەکانی تەبەعیەتی سیاسی یان ئابووریو لە چوارچێوەی ئەو بنەمار





بیروباوەڕانەدا کە سەرکردایەتیی حزبو شۆڕش دایانڕێژاون ، کە پشت بە مامەڵەلەگەڵ یەك ترکردنی وەك یەكو بەرانبەرانەو دەست تێوەرنەدانی کاروباری ناو خۆیان زیان نەگەیاندن بە بەرژەوەندیی نەتەوەو مەسەلە چارەنووسییەکانییەوە دەبەستن .

**دامو دەزگا کوردییەکان**

لەم ماوەیەدا شۆڕش کەوتە هەڵێنانی هەنگاوی گەورە لە ڕێگەی گەشەکردنو



بەرەپێدانی رۆشنبیریی کوردیو بڵاوکردنەوەی خوێندەواریو زانینو هوشیاری لە ناوچەی کوردستانداو بۆ ئەو مەیدانانە یەك یەك دامودەزگای تایبەتی دامەزراند ، ئەوەبوو بۆ یەکەمین جار لە مێژووی کوردیدا کۆڕی زانیاری دانا کە خزمەتی زمانو زانیاری دەکاتو زانکۆیەکی لە سلێمانی کردەوە بۆ ئەوەی ببێتە مەڵبەندی تیشکدانەوەی زانستی بۆ هەموو ناوچەکە ، بەڕیوەبەرێتیی گشتی خوێندنی کوردی بووژاندەوەو خوێندن لە قوتابخانەکانی کوردستاندا بوو بە کوردیو کتێبەکانی خوێندن کران بە کوردیو زمانو ئەدەبی بە دەرس خوێندرا . ئیستگەی رادیۆی کوردی ماوەی بڵاوکردنەوەی زۆربوو بەرنامەو ماددەکانی فراوان کران ، شەپۆلیکی تایبەتی لە تەلەفزیونی کەرکوك بۆ کوردی تەرخان کرا . دەزگای رۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردیش پێویست بە لێدوان ناکات چ دەورێکی گەورە دەگێڕێ لە بواری بەرەپێدانو پێشخستنی ئەدەبو رۆشنبیریی کوردیدا . ئەسانەتی گشتی روشنبیریو لاوانی ئۆتونومیی ناوچەی کوردستان ئەویش پاش دامەزراندنی دامودەزگاکانی حوکمی زاتیی کوردستان کەوتە خۆی بۆ بەشداربوون لە خزمەتو گەشەپێدانی ئەدەبو رۆشنبیریی کوردیدا .

دەستکەوتەکانی گەل لە بواری خوێندنو

•

فێرکردندا ئەوە جگە لە زانکۆی سلێمانیو مەعهەدی هونەریو پەیمانگاو خانەی مامۆستایانو مەعهەدی ئیسلامیو قوتابخانە پیشەییەکان ، ژمارەیەکی زۆر قوتابخانەی ناوەندیو ئامادەیی کرانەتەوەو خوێندن بە جۆرێ پەرەی سەندووە کە لە ژمارەی قوتابیو ژمارەی مامۆستاو قوتابخانەدا بەراورد ناکرێت لەگەڵ پێشوودا ..

# بابی شیعری کوردی لە ئەدەبی کوردیی سەدەی نۆزدەمدا

بەر لەوە من بلێم ، لەخۆوە دیارە ، شیعری کوردی برێتییە لە هەمو ئەدەبی کوردی سەدەی نۆزدەم چونکە بێ لە شیعر هیچ بابەتێکی دیکەی ئەدەب لە نێو کورداندا زمانی کوردی بۆ بەکار نەهاتوە نە لەو چەرخەو نە لەویش بەپێشتر . بە ڕوالەت سەیر لەوەدایە کەوا پەخشان لە زمانی کوردیدا دوای شیعر کەوت چونکە وا چاوەڕوان دەکرێ مرۆڤ زووتر ئامرازی سادەی تەعبیر بەکار بهێنێ ( کە لێرەدا پەخشانە ) ئنجا مەیلەو لەسەرەخۆ و بەدرەنگە کاتەوە تێ‌هەلکشێ بۆ بەکارهێنانی ئامرازێکی باهەڵداوی، تێک‌هەڵکێشی، بەپێوانە و کێشانەی وەك شیعر . بەلام ، ڕاستییەکەی ، لەو ژیانە زێدە هەژارە ـ زێدە سەرەتایی‌یە ـ زێدە سادە ـ زێدە سەراوەی کە گەلی کورد بەدرێژایی مێژوو بەسەری بردوە پەخشان کالایەکی بەفیزوناز و ئەریستۆکرات و دوورەدەست و نایاب بوە کە لە کۆمەلگەی کورددا بڕای بڕای کڕیاری نەبوە ، تەنانەت نامەی عادەتی نێوان خەلق بە زمانی بێگانە ـ بە زۆری فارسی ـ نووسراوە . زمانی بێ‌خاوەن‌و خزمەت تەنها بەسەر زاری ئاخێوەرەوە دەژیت : نە حکومەت ، نە تیجارەت ، نە کەسب‌وکار ، نە مەزهەب و دین هیچیان لە نووسینی ڕەسمی‌و ئەدەبی و زانستیدا بەلایەوە ناچن . زمانی بێ‌خاوەن هەروەك نووسەر و دانەری نابێ ، لە شکلی بەدیهیەدا ، خوێنەرەوەشی نابێ ، ئەگەر بشێ بلێم لە میللەتی وەك کوردی بێ‌فێرگە و دەزگای ڕۆشنبیری بەر لە سەدان سال مومکین بووبێ خوێندەوار هەبووبێ ، کە نەبوە .. مەبەسیش لە بوون‌و نەبوونی خوێندەوار لە نوختەنیگای ڕەواجی پەخشانەوە ئەو ژمارە بە پۆزەیە کە کۆڕ و بازاڕێك بۆ کالا و بابەتەکە پەیدا دەکەن نەك تاك و تەرا . بەهەمەحال حیکایەتی نەبوونی پەخشان لە نێو گەلی بێ‌کیان‌و بێ‌دەسەلات‌و ساماندا خۆی بەتەنها باسێکی بەرفرەوانەو گەلێك هۆ و ئەنجام تێیدا تێك دەکەنەوەو دیاردەیەکی زێدە سەلبی کاریگەر لە کۆمەلدا پێك دەهێنن کە یەکێك لەوان پەیدا نەبوونی زمانی ئەدەبی یەك‌گرتوە ، بەلام ئێرە جێی لێ‌دوان‌و شی کردنەوەی ئەم باسەی تێدا نابێتەوە ، تەنانەت ئەگەر بەدوا شی کردنەوەی تاکە دیاردەی سوڕگوم بوونی مێژووی میللەتی بێ‌پەخشان‌و بێ‌نووسینی ئەدەبی و بێ زمانی یەك‌گرتوو بکەوین بە درەنگەوە لێی دەبینەوە ، بۆیە وەها بەخێرایی و سەرکێل بابی ئەوەی تاکە وشەی ( ئەدەب ) داوای کرد پێیدا تێپەڕیم و لێشی دەرچووم بۆ ئەوەی بلێم : شیعر پتر لە پەخشان دەتوانێ بێ ئەوەی بازاڕی کڕین و فرۆشتن‌و ماملەت لەگەل کردنی هەبێ بژیت و پەرەش بستێنێت چونکە شیعر بەر لە هەمو شتێك سکالای تاکی هەستیارو هونەرکارە لەگەل دەروونی خۆیدا کە ئەمە لە سەرەتاوە پەکی لەسەر کڕیار نەکەوتوە ، ئنجا بەهۆی سۆز و جوانی و ئارایشت و هونەرێکی تێیدا هەیە گوێ‌گرێشی دەبێ بێ ئەوەی لەو گوێ‌گرتنەدا سوود و زەرەر و پێداویستی مادی چ دەخلێکی هەبێ . تۆ لە شیعر ڕاگوێزە بۆ هەلبەستی فۆلکلۆری دەبینی لەوێشدا شایەر و گۆرانی‌بێژ و بەیت خوێن پەکیان لەسەر پالپشتو یاریدەدەر نەکەوتوە ، بە دوا کڕیاریشدا ناگەڕێن چونکە ئەوانیش وەك شاعیر ، بەلام سادەتر لەو ، هەستی دەروونیان لە کولانەی ئەو بەهرە فیترییەی کە دەسەلاتی هەلبەستن و چڕینی پێ‌داون بۆ بەر گوێی نەبیست و بیسەر وەدەر دەنێن ، خۆ ئەگەر کڕیارێك پەیدا بوو لە ڕۆژی شایی و زەماوەند و داوەتدا دەها چاکتر : زێدە پاروێکە لە خوا و بیسەر بە زیاد بێ .

کە زانرا کورد لە سەدەی نۆزدەمدا تاکە بابەتێکی ئەدەبی هەبوویێت شیعر برە ڕێی ئەوە نامێنێت بەدوا لێکۆلینەوە لە پایەی شیعر لە ئەدەبی کوردی ئەو سەدەیە بکەوین چونکە شیعرەکە خۆی هەمو ئەدەبەکەیە . لەم حالەتەدا دەشێ هەوڵ بدەین بۆ دیار خستن و ڕوون کردنەوەی پایەی شیعری کوردی ، وەك کە شیعرە ، ئەویش

لە ڕێی بەراوردکردنی لەگەڵ شیعری دراوسێکانی کە وا ، کەم و زۆر ، ئەوانیش لەو چەرخەدا مەیدانەکانی ئەوسای شیعری کوردییان کوتاوەتەوە ، بەڵام نووسینەکەی من ئەو بەراوردکردنەی نەکردۆتە مەبەسی ئێستاکەی خۆی چونکە نیاز لێرەدا باسی ( پایەی شیعری کوردی لە ئەدەبی کوردی )یە ، کە شیعرەکەش خۆی ئەدەبەکە بوو دروستتر ئەوەیە بزانین پایەی لە ژیانی کوردەواریدا چی بوە ؟ چ دەورێکی دیتوە **لە بووژاندنەوەی ژیانی کۆمەلایەتی ؟ گیانی قەومایەتی ؟ چ کەلێنێکی لە دەروونی مەردمدا پڕ کردۆتەوە ؟ چ خزمەتێکی بە زمانی کوردی گەیاندوە ؟ چ هەنگاوێکی بەرەوپێشەوەی بە کوردگەل هەڵناوە ؟ ئا ئەم تەرزە پرسیارانە و وەرامەکانیان پێوەندی ڕاستەوخۆ و زیندەل لە نێوان شیعری کوردی و کۆمەلایەتی و قەومایەتی کوردەواری ڕوون دەکەنەوە و پایەی شیعری کوردی لە تەك پێكهێنەرە مەعنەوییەکانی ژیان و ژیاری کوردی دەستنیشان دەکەن . بەلام بەر لە هەمو شتێك دەبێ وەرامی پرسیارێکی سەرەتایی دیکە بدەینەوە کە وا جارێ لەم نووسینەدا ڕووبەڕووی نەبووین : چۆن وەها ڕێك کەوت کە کوردستانی خوارو ، لە نکاو ، لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەدا ملی نایە شیعری کوردی ؟ ئەم هەڵبەزینەوە و بازدانە لە چییەوە بوو ؟**

وەك دەزانین شیعری کوردی بۆ یەکەم جار لە کوردستانی خوارووداا لە لایەن نالی و سالم و کوردییەوە بەکار هاتوە . ئنجا ئەگەر ژیانی نالی بکەین بە دیارخەری ئەو ڕۆژ و کاتەی کە شیعری کوردی هەڵێنا ، بێ دەمەتەقە ، سەرەتای شیعری کوردی لە کوردستانی خوارووداا دەکەوێتە یەکەم پێنجیەکی سەدەی نۆزدەم ، چونکە وەك سەرچاوە نووسراوەکان باسی نالیمان بۆ دەگێڕنەوە نالی لە سالی ١٧٩٧ هاتۆتە دنیا ؛ بە پێی ئەوە کە بەشی هەرە هەرە زۆری شیعرەکانیشی کوردین ، تا ئەو ڕادەیەی دەتوانین چاو لەو دوو سێ پارچە هەڵبەستەی بپۆشین کە بە فارسی و تورکی و عەرەبی دایناون ، دیارە هەر لەسەرەتاوە بە کوردی شیعری هەڵبەستوە . خۆ ئەوەی ڕاستی بێ یەکێکی وەك نالی گومانی دانانی شیعری عەرەبی و تورکی لە سەرەتاکانی شاعیریەتیەوە هەرگیز لێ ناکرێ چونکە لەو تەمەنە زوەدا هیچ یەکێك لەو دوو زمانەی نەزانیوە ، زانینێك کە بەسەر هەڵبەستیدا ڕاشکێنێ . دەمێنێتەوە فارسی کە دەزانین بۆ نالی و هەمو هاوچەرخەکانی لە عەرەبی و تورکی ئاشناتر بوە . ئەویش بە سەرنج لێ گرتن هەر دەچێتەوە ڕیزی عەرەبی و تورکی چونکە مەهارەت پەیدا کردن لە زمانی فارسی بای ئەوەی کوردێك شیعری بێ هەڵبەستێ لە نیمکاندا نییە مەگەر دوای خوێندنی فارسی و ئەزبەر کردنی دیوانی شاعیرەکانی فارس . دیارە ئەم مەرجانەش لە تەمەنی ١٢ ـ ١٥ سالیدا بۆ نالی و کەسی دیکەی وەك ئەو نایەتە دی . کەواتە گومان لەوەدا نییە کە نالی ، بڕانی هەستی شاعیریەت و یەکەم دەربڕینی خولیاکانی لە ڕێی هەڵبەستی کوردییەوە بوە . ئنجا تۆ بلێی چ هۆیەکی مێژوویی وەیا کۆمەلایەتی وەیا ڕامیاری وەیا هەر هۆیەکی دیکە بێ پالی بە نالی و هاوڕێکانیەوە ناوە بەرەو هەڵبەستی کوردی ؟

لێرە بەپێشەوە ، لە نووسینی دیکەمدا ، وەرامی ئەم پرسیارەم داوەتەوە ، بەر لە وەرامەکەش زۆر زەین بزێوی و خەیالگێڕیم کردوە بۆ دۆزینەوەی وەرامی پرسیارەکە چونکە لە کەسم نەدەبیست و لە کەسم نەدەخوێندەوە ، دوور و نێزیك ، خۆی لە پرسیارەکە بدات وەیا لە شێوەی گرێ پێچکەدا بیخاتە بەر نیگای خۆی و خوێنەران و داوای کردنەوەی گرێکە بکات .

وەك بۆم ساغ بۆتەوە ، وەیا هەر نەبێ وەك باوەڕم هێناوە ، نالی و هاوڕێکانی لە حوکمڕانی عەبدوڕڕەحمان پاشای باباندا گەیشتنە تەمەنێك شیعری تێدا بهۆننەوە چونکە بە پێی ڕاگەیاندنی سەرچاوە مێژوویی یەکان عەبدوڕڕەحمان پاشا لە (١٢٢٨)ی کۆچی ( ١٨١٣ی زایینی ) مردوە کە لەو سالەدا نالی بە تەمەنی (١٦) سالەیی گەیشتوە ئەمەش تەمەنێکە بەهرەی شاعیریەتی تێدا دەکرێتەوە ، بگرە زووتریش دەکرێتەوە . تەنانەت لەو سەردەمانەدا مرۆڤ کە بلوغی دەبوو هەستی بەرپرسیاری خێزان و گوزەران گێرانیشی بەخەبەر دەهات و بەزۆری لەو تەمەنەدا ژنیشی دەهێنا . باری ئێستاکەی ژیان و گۆڕانی شێوەی کۆمەلایەتی و قانوونی و جۆری گوزەران و خوێندن و دەوری حکومەت لە نەخشەی کۆمەل و سەروبەرێکی بەسەربردن و هەلکردن وای کردوە لەم ڕۆژگارەدا مرۆڤی شازدە سالی بە دەمڕووت و هەرزەکار لە قەلەم بدرێ لەمەشدا ئێستاکە و ڕابردوو هێندەی بلێی لە یەکدی ترازاون چونکە ئەم هەرزەکارە شازدە سالییە بەر لە (١٠٠) سال بە پیاو دەخوێندرایەوە بە تایبەتی لە نێوان خێل و

ئێلەکاندا کە بە فەرمانی پێداویستی گوزەران ، ئەرکی بەرپرسی‌و پەلەی ژیان خێراتر نێرینەی دەرودەشتی لە مندالیەوە هەلدەداشت بۆ ناو جغزی کاملی . زووتریش شووی بە کیژان دەکرد .

**ئەم ڕاستییەی گەیشتنی نالی‌و هاوڕێکانی بە تەمەنی شاعیریەت لە حوکمرانی عەبدوڕڕەحمان پاشادا دەچێتەوە ڕووناکایی ڕاستییەکی‌دیکە کە وا لەبەر تیشکی ئەودا دەبینین چۆن لە شێوەی حەتمی هەلبەستن بە زمانی کوردی لە لایەن شاعیرەکانی بابانەوە دەبێتە بڕیاری مێژوو : عەبدوڕڕەحمان پاشا یەکەم ئەمیری بابان بوو دەستی دایە کوردایەتی و لێشی بەدیار کەوت ، واتە ئەم مرۆڤە لەوە دەرچوو وەك میرێکی عادەتی حوکمخواز و دنیا دۆستی ڕووت بێت چونکە وێڕای نیازی شەخسی لە حوکم و دەسەلاتدا هەستی نەتەوایەتیش پالی پێوە دەنا بەرەو وەدەست هێنانی چارەنووس بۆ میللەتەکەی .**

خوێندنەوەی ئەم هەستە پیرۆزەی نەتەوایەتی لای عەبدوڕڕەحمان پاشا لەوانە نییە چاو و زەینی سەرنجدەر ماندوو بکات چونکە لە زۆر لاپەڕەکانی ژیانی ئەم ئەمیرەدا کردەو گوتەی ئەوتۆ نووسراوە کوردایەتی بێ‌فێل دەلێنەوە : یەك لەوان قسە مەشوورەکەیەتی لە ئاست ئەو پێشنیارەی بۆی کرا کە ببێتە والی بەغدا بە روتبەی وەزیری ئەویش هات‌و گوتی یەك فڕە بەفراوی کوردستان بەوە ناگۆڕمەوە .. دوەمیان ئەو وەقفنامەیەتی کە بە سەر کتێبی دەنووسی ( صحيح البخاري )یەوە سنووری قەلەمڕەوی بابان دەکێشێت و کتێبەکە وەقف دەکا بۆ ( العلماء العاملين بناحية كردستان بين الموصل و بغداد و سنندج .. ) وەك دەشزانین کتێبی ( صحيح البخاري ) لای کوردی سوننی لە دوای قورئانەوە دێت کە ئیتر خزمایەتی بە هەرچی سەر بە دنیاوە هەیە نایمێنێت ، جا ئەگەر هەستێکی زێدە بەهێزی نژادناسی تێکەل بە هەستی خواناسی نەبێ کتێبەکە لە قەبەل تەنها عولەمای سەر بەنژادێکەوە ناکرێت ... سێیەمیان قسە ئاگرینەکانی عەلی بەردەشانییە لە بەیتی ( عەبدوڕڕەحمان پاشا ) کە هەمووی دەنگ دانەوەی سرکەو کورکەو ڕازو نیازو وتووێژو قسەو ڕاوێژی دیوەخانەو بارەگا و سبا و دەستەودایەرەی سەر بە عەبدوڕڕەحمان پاشایە کە عەلی بەردەشانی وەها بە بسپۆڕی دەیانکاتە هاندەر و وروووژێنەر و پالپێوەنەر و تەکاندەر . وا لێرەدا بەشێکی سەرەتای ئەو بەیتە بەشایەد دەگرم بۆ دروستبوونی ڕایەکەم :

**ئەزم عەلی بەردەشانی**
**دەبەندێم ئەکەی زمانی**
**بەیتی دەلێم بەدیوانی**
**مەدحی پاشای کوردستانی**
**مەدحی پاشای کامیان باشە**
**شایەد ڕۆمو قزلباشە**
**هەر جاری شیری دەکێشا**
**هەمووی دەهاتنە تەماشا**
**عالەم ئالایە چاوەشە**
**مەردە عەبدوڕڕەحمان پاشا**
**پاشای بەبان جیهانگیری**
**تەحا بە ڕا و تەگبیری**
**ڕا نابوێری بە ڕەزیلی**
**ناکەم خزمەتی وەزیری**
**نانی دەستێنم بەشیری**
**بە شیر نەبێ قەت پێك نایێ**
**دەولەت نایەتە ڕەدایێ**
**ناچمە سەفەری لەحسایێ**
**یاغی دەبم لە بەغدایێ**
**یاغی دەبم ئینشائەللا**
**خزمەتی ناکەم بە وەللا**
**نافەرێم و بارەکەللا**
**تەوەکول بە تەعالەللا**
**هەی کوڕە بەبەینە هەللا**

ئەوەی ئەختێك وێنەی ڕووداو و ڕۆژگار و چەندوچۆنی سەردەمی خۆمان‌و ئەو سەردەمانەی کە لە مێژووەوە بۆمان پارێزراوە لە دلدا هەلگرتبێ دەزانێ لەرز و تای نەتەوەپەرستی ناو ئەو بەیتەی بەر لە (١٦٠) سالێك گەلێك گەلێك بەولای هەستی کوردایەتی دەیان سالی سەدەی نۆزدەم‌و بیستەمی بەشێکی زۆری سەرلەبەری میللەتی کوردەوەیە : بێ‌گومان پۆرگی هەنار و تەلی زمانی عەلی بەردەشانی ئاخناو و تەرجومانی ڕەهێل‌و هەورەتریشقەی نیشتمانپەرستی دەوروبەری خۆیان بوون .

**هەستی نەتەوایەتی عەبدوڕڕەحمان پاشا کە وا ڕاستییەکی ئەولای گومان‌و دەمەتەقەیە زادەی سەردەمێکە بە بەریەوە هەبوو مرۆڤی هەستیار و هۆشیار و بەپەرۆش‌و دل ئاوەدانی وەك ئەو پیاوەی تێدا بکاتە خۆناسینەوەو شانازی**

بەگەل و مەفتەنەوە کردن .

کە سەرنجێك بدەینە مێژووی کتێبە دەسخەتەکەی بوخاری ( ١٢١١ی کۆچی ) دەبینین ئەو ساڵە دەکەوێتە بەرانبەر ( ١٧٩٦ – ١٧٩٧ )ی زایینی ، واتە ٧ – ٨ ساڵێك دوای بەرپابوونی شۆرشی فرەنسە ، وەك دەشزانین ئەو شۆرشە ڕووداوە مێژوویی‌یە ڕاگەیەنەرەکەی بیری قەومایەتی و مافی نەتەوایەتی بوو نەك هەر لە ڕێی پەند و سکاڵا و ئامۆژگاری‌و فەلسەفەوە ، بەڵکو بەهۆی دەمە چەقۆی ئاگاکەرەوەی کارەساتی پڕ ژان‌و ژوارو بەسفت‌وسۆی تێك‌هەڵقژان‌و ڕەو بردن‌و لەسەرخۆ کردنەوەو تێك‌دان‌و بنیات نان‌و خوێن‌و ئاگرو بوومەلەرزەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و ڕامیاری و زانستییەوە . ئنجا کە میرێکی ئاسۆ فرەوانی تێگەیشتووی بەرژەوەند زانی وەك عەبدوڕڕەحمان پاشا بەندی بیری نەتەوایەتی لەو ڕووداوە بێ‌ڕەزایە دەربگرێ‌و لە کردەو گوتەو دەوروبەری تا دەگاتە شایەری بەیت بێژی بەدەر بداتەوە جێی خۆیەتی ، بەڵکو لە پێداویستەکانە ، کە شاعیرەکانی بکەنە پلەی هەڵبەستن بەزمانی دایکزادە .

**ئەم گوورانو ڕسکانەی ئاوهەوای ( شیعری کوردی ) بەدوا شۆرشی فرەنسەو لە حاکمایەتی عەبدوڕڕەحمان پاشادا جارێکی‌دیکەش لەوەدا خۆ بەدیار دەخات کە شاعیری کورد لە سەرانسەری کوردستانی عیراق‌و ئێراندا ، بێ‌وەخران ، شوێن پێی نالی‌و کوردی‌و سالمیان هەڵگرتەوەو کەوتنە سەر ڕاڕەوی هەڵبەستی کوردی هەر دەڵێی ، کوردی گوتەنی ، بیستانێك بوو بێنی تێ‌گەڕابوو چاوە لوڕی شەپۆلێکی گەرما بوو کاڵك‌و کۆڵك‌و گۆزەڵەکانی تێکرا بگەن .**

ئەم قۆناغە زێدە گرنگەی ژیانی کۆمەڵایەتی‌و نەتەوایەتی کورد کە شاعیری کوردی تێدا گەیشتە پلەی هەڵبەستی کوردی تیشکێك بەرەو دواوە دەهاوێژێت و دیمەنێکی پڕ دەلالەت هەستی فیتری قەومایەتی ڕووناکتر دەکاتەوە : بەر لەوەی شیعری کوردی پەیدا بێ هەر دەڵێی کورد شاعیری نەبوە . ئاوناوەیەکی زۆر کەم نەبێ ، تاك‌و تەرا ، لێرەو لەوێ کوردێك قەسیدەیەك‌و غەزەلێك‌و دوو بەیت‌و سێ بەیتی بە فارسی دەیا عەرەبی دانابێت لەوە بەولاوە چی ئەوتۆمای لە بەرهەمی شاعیری کوردستانی خوارووی سەدەی نۆزدەم‌و پێشووتر پێ‌نەگەیشتوە ( دیوان ) پێك بێ . ئەگەر مەلا عەبدوڵڵای بێتوشی‌و شێخی نۆدەهی ( لە شیعری عەرەبی – کە بە زۆری هی موناسەبە و هی دینن )و مەولانا خالید ( لە فارسی و عەرەبی و کمێکی کوردی بە لەهجەی هەورامی ) و حاجی بەکر اغای کۆیێ لە حیسابان دەراوێین تەنها دەمێنێتەوە ئەو چەند بەیتەی کە مێژووی مەرگێك وەیا منداڵ بوونێك وەیا خانوو دروست کردنێکیان بە حیسابی ئەبجەد پێ‌دەرهاتوە ، ئەویش ئاغلەب بە فارسی ، کەمتاکورتێکیش وەها بوە نامەی برادەرانە هەڵبەستی فارسی لە نێواندا هاتوپۆیەکی کردوە . خولاسە دەتوانین بڵێین لە کوردستانی خوارووودا بەر لە پەیدابوونی هەڵبەستی کوردی شیعرێکی ئەوتۆ بە غەیری کوردی نەبوە تێ بخوێندرێتەوە هەرچەند لەو سەردەمانەدا مەلایەتی‌و شێخایەتی ، کە بنەمای خوێندەواری ئەوسا و جێ مەزەندەی شاعیری بون ، لەو پەڕی گەشەدا بوون . وا دیارە شیعر کە پێوەندی سەرەکی بە هەست‌و سۆزی دەروونەوە هەیە پتر لەگەڵ زمانی دایکزادا ئامادەیە لە زوێکەوە بپژێ . ئەوەی بە تەما بێ لە ڕێی زمانی بێگانەوە وترویژی دەروونی دەربڕێت سەردەمی گەنجایەتی‌و گوڕی عاتیفەی لە دەست دەچێ ئنجا دەتوانێ هێندە مەهارەتە پەیدا بکات کە لەو زمانەدا شیعر هەڵبەستێ . ئەوساش بە خۆهێنان‌و بردنێکی ئەرکدار چەند بەیتێکی ساردو سڕی موناسەبە گەلاڵە بکات .

هەر ئەم هۆیەی تەقینەوەی بەهرەی شاعیریەت بە زمانی دایکزا وای کرد شاعیری کورد بتوانێ پتر لە جاران بە زمانی بێگانە ، فارسی بەتایبەتی ، شیعرا دابنێت چونکە دەمەزەن کردنەوەی هەمیشەیی بەهرەکەی بە زمانی دایکزا کە لەسەرەتای عومری شاعیریەتیەوە گەشابۆوە دەبوە مانیعی کوێر بوونەوەی تواناکەی بۆ بەکارهێنانی ئەو بەهرەیە لە هەر زمانێك بێت کە تێیدا بەڵەدە ، هەرچی جاران بوو تا دەهات فێری زمانی بێگانە بێ لە تەمەنی پڕ هەیەجانی عاتیفەی گەنجایەتی دەترازا بەرەو تەمەنێك کە وەك گۆمی بەر ڕێژگەی قەڵبەز ڕادەوەستێت‌و کەف‌وکوڵی هەڵڕژانی دەپووچێتەوە . هەر لەم کولانەوە ، بە قیاس ، تێ‌دەگەین چۆن مەلای دانەر و پەراوێزهۆن ( موءلف و محشی ) هەلی تەئلیف‌و حاشیە نووسی بە زمانی عەرەبی لە دەست نەدەچوو چونکە حاشیە و تەئلیف بەرهەمی پێگەیشتن‌و تێگەیشتن کە هیچ پێوەندیان بە گەنجایەتی‌و عاتیفەو بەهرەی شاعیریەتەوە نییە ،

بە پێچەوانە ، لەگەڵ تەمەنی کامڵیدا گونجاوو خزمو دراوسێو بران .

**نەبوونی هەڵبەست بە زمانی بێگانە لەلایەن خوێندەواری کوردەوە دیمەنێکیدیکەی قەومایەتی - کۆمەڵایەتی لە خۆی بەرفرەوانتر دەکاتەوە بۆ بەر چاو و زیهنی سەرنجدەر : کە خوێندەوارەکە نەیتوانیبێ وەیا نەیویستبێ بە زمانی دەرەکی شیعر هەڵبەستێ نەخوێندوەکە هەرگیز نەیتوانیوە ، بگرە بە بیریشیدا نەهاتوە ، شیعری بێگانە لەبەر بکاتو بیلێتەوە چونکە دیارە شتی نامەفهووم لەبەر ناکرێ ، کە بە زۆرە ملێو نیوەچڵ لەبەریش کرا گوتنەوەی بە شێوەیەکی شکستەی ناقۆلا و ناحەز دەبێتە خەیاڵ شکێنێ نەك دڵ بزێو ، ئەوسا لە کودولەی تەڕیشدا گوێ گری نابێ بەڵکو دەشێ گوێ گران شیعر خوێنی ئەوتۆیی دەمکوت بکەن ئەگەر لێی نەدەن .. !**

لەم بۆچوونەوە دەردەکەوێ کە وا بەر لە پەیدا بوونی شیعری کوردی کۆڕی بەزمو ئاهەنگو کۆبوونەوەی خۆشیو شاییو مەجلیسی ئیجازەی مەلایان و دانیشتنی شەوانەی دیوەخانان . بە دەگمەن نەبێ . شیعری تێدا نەگوتراوە ئەوەی گوترابێ بابەتی فولکلۆری کوردی بوە وەك بەیتو لاوكو حەیرانەو گۆرانیە ڕەسەنو میراتیەکانی ئەڵڵاوەیسیو خاوکەر و تێكهەڵکێشو ئاباێو نیوەشەو و ئەو تەرزە دەنگو ئاوازانە . هەروەك لەم ڕۆژانەی خۆمان تێیدا ژیاوین خۆشکەرەوەی بەزم و ئاهەنگ شیعر و هەڵبەستی کوردی بوە . بە قیاسی ئەولاتەریق ، گۆرانیچڕ و گوێگری کوردی بەر لە سەدەی نۆزدەم هەنگامەی کەیفو شادی خۆی بە ئاواز و هەڵبەستی دایکزا تەنیوەتەوە نەوەك دەنگو وشەی نامەئلووفو نامەفهووم تەڕدەماغیەکەی لێبشێوێنێ . ڕاستییەکەی،نەفسی ئادەمیزاد لە دەمی خۆبەردان بۆ شادیو خوزن ، وەك ساوا ، گڕوگاڵو لاواندنەوە بە تاکە زمانی دایکزا و شیرمژ هەڵدەڕێژێ چونکە تەقینەوەی عاتیفەی گەلێك خێراتر و کەلەڕێژترە لەوەی گیر بخواتەوە بە دەست تەرجەمە و ڕێك خستنو سازاندنو وەپێر هاتنەوەی لەسەرەخۆ و بەکێشانەو پێوانەی مامۆستایانە . بەهەمە حاڵ قسەی ئێمە لێرەدا لەگەڵ ئاپۆرەی خەڵقە نەك تاكو تەرایەکی بۆی ڕێك کەوتبێ کە هێندە لە نێو بێگانانا ژیابێ زمانەکەیانو هەمو ئادا و دابو دەستوورو بۆچوونو هەستونەستیانی لێ بووبێتە هاوتای سروشتی زگماك .

ئەم خۆدانەوە بەزمانی دایکزا ، نەك هەر لەدەمی خۆشیو ماتەمدا ، بگرە لە هەموو هەڵوەستێکی ئەوتۆدا کە مرۆڤ موحتاجی قسەی گورجوگۆڵو لەسەریەكو نیشانەنەنکێو و دابڕ و دازڕ بێ هانا بردنێکی ئاسایی و سروشتییە بۆ بەرچەکە هەرە بڕندەکەی لەسەرخۆ کردنەوەو هەڵمەتبردن وەك ئەوەی کە لە کاتی هەرای شەڕە چەپەڵۆكو تێكهەڵقژانو شەڕە جنێو و یاری و گەپرا کەس بە بیریدا نایەت خەیاڵ لە قسەی ناو کتێبان بکاتەوە وەیا قسەی دەماودەمی بێگانە بە بیری خۆیدا تێپەڕێنێت ، تەنانەت زمانە ئەدەبیەکەی خۆشی لەو دەمەدا فەرامۆش دەکاتو

یەك ڕستەی لێ بەکار ناهێنێت . ئەم ڕاستییە پتریش ڕوون دەبێتەوە بەوەدا کە تا ئێستا لەو تەرزە حاڵو بارانەدا شیعری نوێ بابەتی ڕەها بەکار نایەت . تاکە یەك گۆرانی لە دەمی کەس دەرنەهاتوە شیعری بێکێشو قافیەو پڕ لە پەردەو دەرگەو دۆلابی تازە بابەتی گوتبێتەوە هۆیەکەش دەچێتەوە بۆ نەگونجانی عەفویەتی گۆرانی لەگەڵ ( معاناة )ی هەردوو ڕووی ڕوخسارو ناوەرۆکی شیعری نوێ .. لەم تێبینیانەوە بۆ ئەوە دەچم کە گۆرانیبێژی کورد بەر لە پەیدا بوونی شیعری کوردی دەمی لە شیعری بێگانە نەداوە . ئنجا کە ئەمە وەها بێ دەزانین شیعری کوردی چ کەلێنێکی گەورەی لەو بەتاڵاییەیە جوانکارییە هونەرییەی ڕووپێوێکی بەرینی ژیانی ئەدەبیو کۆمەڵایەتیو ویجدانی کوردی پڕ کردۆتەوە . تۆ بێنە دیمەنی ئێستاکەی کۆڕی بەزم و شادی پڕ لە ئاوازو زەمزەمەی شیعری کوردی بگرە بە دیمەنی ئەو سەردەمانەی کە بەر لە پەیدا بوونی شیعری کوردی وشکێنو برینگێنو بێتەڕاوەتی غەزەلو قەسیدەی شلكو ڕازاوەی کوردی بوون ، ئنجا بیر لەوەش بکەوە کە گۆرانیبێژو گوێگری کورد چ ناتەواویەكو نوقسانیەکی گەورەی هەست کردوە لە نەبوونی غەزەلو قەسیدە بەسەر لەرزەو لەرەی ئاهەنگەکانیەوە . ڕەنگە ناوناوەیەك کە لە دەمی دەروێشو گەڕیدەی جیهانپێوەوە گوێگری کورد غەزەلی فارسی بیستوە حەبەسانێكو سەرهاتنەوەیەکی بێڕەوانەوەی تووش هاتبێو هەستی ناڕاحەتی لە دیارنەبوونی کالایەکی ئەوتۆی کوردی دایگرتبێ تا ئەو ڕۆژەی کە لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەمدا پاڵەپەستۆی مێژوو و لێهاتوویی عەبدوڕڕەحمان پاشا بلوێرە سیحرییەکەی

هەڵبەستی کوردییان نایە سەر لێوە گەوهەرپڕژێنەکەی نالی‌و سالم‌و کوردی ، ئیتر لەوانەوە زۆر بەخێرایی تێکڕای شاعیری کورد کەوتنە سەر ڕێبازی چڕین‌و هەڵبەستی کوردی .

خۆشامەدی کردنی کۆمەڵگەی کورد زمان لە شیعری کوردی گەیشتە رادەیەك کە ئەگەر بێتتر شاعیری کورد لە ئالقەی پیاواندا دەست نەدەکەوت دواتر ناوناوە ئافرەتی کوردیش بوو بە شیعربێژ . بەڵێ ڕاستە ژمارەی شاعیری ئافرەتی کورد تا بڵێی کەمە بەڵام دیسانەوە کە ئەو کەمتا کورتە بە نەبوونی شاعیری کورد دەگرێت‌و بەراورد لە نێوان هەبوون‌و نەبووندا دەکەیت ژمارەکە بەزیادەوە گرنگ دەبێت . هەرچەند ( ماه شەرەف ) لە لایەن بەکارهێنانی کوردییەوە ناگاتە ( ماه شەرەف )ی بوێژی فارسی ، ئەو حیسابەی هەر بۆ دەکرێ کە ئەویش لە پلەی پەیدا بوونی هەڵبەستی کوردیدا بۆتە بوێژ و شیعری کوردیشی هەن .

لەگەڵ ئەوەشدا کە دەوروبەر و پەروەردە بوون یارمەتی ماه شەرەفی دابێت بۆ گەیشتن بە پایەی بوێژی دیسانەوە نەدەهات بەکوردی شیعر بڵێ ئەگەر شیعری کوردی لەبەر گوێیدا نەزرینگابایەوە ، نالیش نەدەهات بە نشبەری زمانی کوردی گەوهەرەکانی بۆ بسمێ ئەگەر لایەنی کورد بوون‌و شاعیری کورد بوونی ماه شەرەفی ڕەچاو نەکردایە . لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەمدا بوێژێکی خاتوونی وەك ( حەزینە ) لە کۆیە ماوەیەکی بەرفرەوانی مەیدانی مەهارەت‌و شارەزایی لە شیعری کوردی بڕی تا ئەوەی لە بەشێکی شاعیرانی ئەو سەردەمەش پێش کەوتەوە . بێبەش بوونی ئافرەتی کوردی ئەو ڕۆژگارانە لە بەهرەی خوێندەواری هۆی کەم‌بوونی ژمارەی ئافرەتی کوردە لە بوێژیدا ، ئەو چەند تاکەی کە بووشن بە بوێژ لەوانە بوون دەوروبەر کردبوونی بە خوێندەوار .

دیاردەی نەبوونی شیعری بێگانە بەسەر زمانی گۆزانی‌بێژی کوردەوە بیرمان بۆ دیاردەیەکی دیکە دەبات کە ئەویش هەر دەچێتەوە بۆ گونجانی عەفوییەتی زمانی دایکزا لەگەڵ عەفوییەتی کرانەوەی دەروون بۆ شادی‌و حوزن : شیعری هەریەکێك لە لەهجەکانی کوردی تەنها لە نێوان ئاخێوەری ئەو لەهجەیەدا دەبیسرا چ بەگوتنەوە بێ و چ بە گۆرانی ، ئەوەی کە لە بابەتی لەهجەیەکەوە بۆ لەهجەکانی دیکە بڵاو دەبۆوە شتی فۆلکلۆری بوو ، بەتایبەتی بابەتێك کە سەرگورشتە و حیکایەتی دەگێڕایەوە وەك زوربەی لاوکی لەهجەی سەروو : بەعادەت گوێگری گۆرانی هەتا بەستەو شیعری لەهجەی خۆی چەنگ بکەوێ گوێ بۆ شتی‌دیکە شل ناکا ، بەڵام کە لە گۆرانیدا باسی بەسەرهاتی دڵداران وەیا شەڕی نێوان چاپوك سواران وەیا هەر ڕووداوێکی‌دیکەی ئەوتۆیی هەبێ خەڵقەکە سەرەڕای بیستنی دەنگی خۆش‌و ئاوازی سازگار لەو گۆرانیانەدا ، بەدیار باس‌و خوای صالحی نۆی قاوەچی‌و کەژێ‌و گەنج خەلیل‌و شێخ قادرو فەتاح بەگ گوێ‌و دڵ دەکەنەوە هەرنەبێ بایی ئەوەی کە بۆ سەرگورشتەی حەفت دەروێشەو سەلیمی جەوهەری‌و کۆرەی یەمەن قوتاخ دەبن . وەك بە سەرنج گرتنیش دەردەکەوێ ، بابەتی فۆلکلۆری لە نێوان ئێلەکاندا لە لەهجەیەکەوە بۆ لەهجەیەکی‌دیکە پتر برەو دەستێنێ نەك لە نێوان دانیشتوانی شارستان وا شبزانم هۆی ئەم ڕاستییە تا ڕادەیەك دەچێتەوە بۆ هاوچوون بوونی زەوق‌و خەریك بوون‌و ڕێکاری تێگەیشتن‌و نرخاندن‌و سەنگاندن‌و پێوانەی ( نرخ‌و گرنگی ) شتان لە نێوان ئێلەکاندا کە لە سەرەتا و بنەڕەتدا باری کۆمەڵایەتی‌و ژیاری‌و گوزەرانیان پتر لەگەڵ یەکتردا هاوچوونە نەك لەگەڵ هی شارستان . تۆ سەیری حەیرانە مەشوورەکەی دزەییاتی بکە ، دەبینی پتر لە دەشت‌و دەر و نێوان ئەهلی عەشرەتدا دەگوترێتەوە . بەهەمە حاڵ ئەم لایەنە لێرەدا بە تەواوی مەودای ساغ کردنەوەی نییە : دیاردەیەکە لە شیعرو هەڵبەست‌و گۆرانیەوە . کەوا ڕەنگ دەرەوەی کۆنەڵایەتین ، سەر هەڵدەدات . بەڵام دەبێ ئەوەندە بخەمە سەر قسەکانم کە نامەئلووف بوونی لەهجەیەکی زمان لە بەر گوێی ئاخێوەری لەهجەیەکی‌دیکەدا دەچێتەوە بۆ لەیەکدی دابڕانی خەڵقەکە ، وا بە چاوی خۆشمان دەبینین لەوەتەی هۆی یەکدی دیتن‌و یەکدی‌بیستن‌و لەیەکدی شارەزا بوون پەیدا بوە ، بەتایبەتی ڕادیۆ ، خەریکە سەرلەبەری گوێگری میللەتێك ، چ کورد چ غەیری کورد ، گەلێك پتر لە جاران بە دیار گۆرانی لەهجە جوداکانیەوە دەگەشێتەوە ، هەتا دەنگی گۆرانیەکەش دلکێشتر بێ گەشانەوەکە گەشکەدارتر دەبێ . .

هەڵبەستی کوردی کوردستانی خواروو لە

سەرەتای پەیدابوونیەوە شەقڵو چەژو دارشتنو روخسار ، تا رادەیەکیش ناوەرۆکی شیعری فارسی بە خۆیەوە گرت ، لەمەشدا بێ گومان خزمایەتی نێوان هەردو زمان وێرای تاو و تین ئەدەبی فارسی بۆ ویژدانی ئەدیبو خوێندووی کورد دەوری هەرەگەورەی هەبوو . خەیاڵی شاعیری کورد لە خەیاڵی شاعیری فارس نێزیك دەبۆوە نەك هی عەرەبو تورك کە دەزانین شاعیری تورکیش لە شیعردا پتر شوێن پێی شاعیری فارسی هەڵدەگرتەوە نەك هی عەرەب . هەرچی زمانی عەرەبییە لە لایەن مسڵمانی غەیری عەرەبەوە لە قەبەڵ باسەکانی ئاینو زانست کرابوو ، تەنانەت مەلاکان کە هەموو عومری خوێندنو مەلایەتییان لەگەڵ ( صرف و نحو )ی عەرەبیدا بەسەر دەبرد نەیاندەتوانی دوو قسەی عادەتی بە زمانی عەرەبی بڵێن مەگەر مەلاکە خۆی لەگەڵ عەرەبدا ژیابێت ، لە راستیشدا زمانی نەحوی عەرەبی بەلای عەرەبیشەوە هەر سەختە چونکە دەستوورەکانی زەحمەتترن لە دەستوورەکانی ئەو عیلمەی پێی دەخوێندرێ . شاعیر هەتادێت هەستو سۆزەکەی خۆی دەداتەوە بە حوکمی ( مرفوع و منصوب و غیر منصرف و منتهى الجموع .. )و ئەو تەرزە دەستووره ورد و پەنامەکیانە هێزی بوێژیو دارشتنو قافیە سنجی لێ دەبرێت : یەکێك دەتوانێ لەگەڵ دەستوورە سەختەکانی ( صرف و نحو )دا شیعربێژ بێت کە لە منداڵیەوە بە هۆی راهاتنو مشتومال بوونی زەوقە ئەدەبیەکەی لەگەڵ ئەو دەستوورانەدا صرفو نحوەکەی لێ بووبێتە بەشێکی پێکهێنەری هێزی ئاخاوتنو مەلەکەی شاعیریەت نەخۆ هەروەك مەهارەتی وەستای بەننا بە سەیرکردنی سادە پێك نایەت تا راهێنانی دەستی لەگەڵدا دەبێت هەروەهاش هەڵمشتنی دەستوورەکانی ( ثلاثي مجرد ) لە لایەن مێشکەوە بەراشکاوی نابێتە زمانرەوانی ئەگەر لە فێربوونیاندا زمان هاوبەشی مێشك نەبووبێت .

**یەکێك لەو شەقلانەی شیعری فارسی کە بۆ شیعری کوردی راگوێزرا نازناوی شاعیر بوو ، صەد جارانیش دەستیان خۆش بێ لەو کارەی کردیان هەرنەبێ لەبەر دوو هۆی یەکجار گرنگ :**

هۆی یەکەم ئەوەیە کە ئەگەر ( نازناو ) خاوەنایەتی پارچە هەڵبەستەکە بۆ دانەرەکەی نەپاراستبایە لەوانە بوو بەشێکی زۆری شیعری ئەو سەردەمانە کە جارێ چاپ کردنی دیوانی شاعیری کورد فەرمانێك بوو دەیان ساڵ دوای مەرگی شاعیر جێبەجێ دەکرا ، بۆغەیری خاوەنەکەی ساغ ببێتەوە و دروشمی شاعیرەکانمان لەو رێگەوە تێکەڵپێکەڵ بەڵکو کوێر ببێتەوە . ئێمە دەزانین لەگەڵ هەبوونی نازناویش گەلێ جار هەڵبەستی شاعیرێکمان بۆ یەکێکیدیکە دەبردرێتەوە لەمەشدا شیعری کوردی گەلێك پتر لە هی عەرەبو تورکو فارس دووچاری خاوەنگۆری بوە . وا بێ دەچێ کورد کەمتەرخەم بوە لە رێك خستنی دیوانی شاعیرەکانی تا ئەوەی یەکێکی وەك حاجی قادر لە ئەستەمبۆڵەوە دەستو دامانی هاوولاتیەکانی دەبێو دەڵێ :

**ئەی رەفیقانی وەتەن زۆر غەزەلم ماوە لەوێ**
**لە کەلێنێکەوە تەقدیرە وەکو هەڵبکەوێ**
**وەك سەفینە بگەرێی بیدەیە بەر مەددی نەزەر**
**حەیفە وەك من لە غەریبی بمرێتو نەتەوێ**

ئنجا کە حاڵ ئەمە بێ پارچە شیعرەکانی بێ مۆری نازناو چۆناوچۆنی بۆ خاوەنەکانیان دەبرێنەوە ؟

هۆی دوەم ئەوەیە کە هەبوونی نازناو بە کۆتایی شیعرەوە وەك تەزکەرەی نفوس گەلێك باری شیعرەکە روون دەکاتەوە : دەزانین هی کام رۆژگارە .. هی کام مەڵبەندە .. تێدەگەین چ جۆرە گۆرانێك بەسەر ئاخاوتنی ئەو مەڵبەندەدا هاتوە لە چاو ئاخاوتنی ئێستاکەی . بە نموونە لە شیعری نالییەوە تێدەگەین کە بەری بابان لەو سەردەمەدا وشەی وەهای تێدا بەکار هاتوە کە ئێستاکە وەك تێیدا نەمابێ وەهایە :

**دوور لە تۆ ئیدی مەپرسە قوربان**
**حاڵی نالی کە نە مرد و نە ژیا**

وشەی ( ئیدی ، ئی‌دی ـ بە واتای ئیتر ) لە ئاخاوتنی ئێستاکەی سلێمانی بەسەر چوە .

هەر نالی خۆی لە جێگەی ( ئە )ی ئایندە (دە) بەکار دەهێنێ :

**ریشەکەی پانو درێژی بۆ ریا خزمەت دەکا**
**من گریە ئەتۆ خەندە بە یەکدی دەفرۆشین**
**لێت موعەییەن بێ کە نالی گوڵ بە دڵ پەرژین**
**دەکا**

خولاسە نازناو گەلێ سوودی هەیە ، بگرە لە سوود بەولاوە تێیدا نییە .

# «کلۆدێل» و سەرنجەکانی دەربارەی هەڵبەست

وەرگێڕانی : لەتیف هەڵمەت

**هەتا ئێستاش هەندێ کەس گێچەڵی – هەڵبەستی پەتی – یان لەیادە کە لە سالی – ١٩٢٧ – دا – بریمۆن –ی قەشە هەڵیگیرساندو رەخنەگرەکان هەڵچوونو کەوتنە لێکۆڵینەوە لەرادەی راستیو دروستی قسەکانی .**

**لە سالی – ١٩٦٢ – دا کتێبێکی شاعیری گەورەی فەرەنسایی – بۆل کلۆدێل – بەناونیشانی – سەرنجدان لەشیعر – لەدایك بوو ... کتێبەکە بریتی بو لە نامەیەك کە ئەو کاتە بۆ – بریمۆن – ی قەشەی نووسیوە لەگەڵ پێنج لێکۆڵینەوەی باشیشدا دەربارەی ناوەڕۆکی هەڵبەستو بابەتەکانیو پەیوەندی بەنایینەوەو هونەری هۆنینەوەو هۆنراوەی سەربەست ...**

بەپێی بۆچونی – ریمۆن –ی قەشە ... شیعر – بەهرەیەکی شیعرییە – و ئەو بەهرە شیعرییەش لە – سروشەوە – هەڵدەقولیو زیاتریشی پەیوەندی بەئەندێشەو هەستناسکییەوە هەیە .. نەك هۆشو بیر ...

– کلۆدێل – یش گومانی لەوە نیە کە – بەهرەی شیعریی – هەیەو پەیوەندییەکی چڕی بە ئەندێشەو هەست ناسکییەوە هەیە ... بەڵام بەلای ئەوەوە ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە ئیتر بیرو هۆش هیچ رۆڵێك لە لەدایکبوونی شیعردا ناگێڕێت ... چونکە هەڵبەست بیرۆکەیەکە بەوشە دەیخولقێنین ... لەبەر ئەوە ئەندێشە پێویستی بە بیرێکی روونو بەهێزو تیژ هەیە ... بیریش کارێکە بەهۆشەوە بەندە ... هەروەها دەبێ هەست ناسکی لەجۆششو وروژاندابێ لەبارەی ئەو شتو بابەتەوە کە شیعرەکەی سەبارەت دەنووسرێ ... ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە کاری هونەریی بەرێکی گەیو ... لە هەرموەزیو هاوبەشی ئەندێشەو ئارەزوویەکی بەجۆشدا دێتە کایەوە .

بەڵام سروش بەلای ( کلودیل )ەوە نزیکەی سێ واتای جۆر بەجۆری هەیە یەکەمیان واتای گشتییەو نزیکە لەنامەی سروشتییەوە یان بەهرە ... یا توانای ئامێتە کردنی ئەندێشەو ئارەزووی بەجۆش لەبۆتەی وشەدا ... بەم پێودانگە بەشاعیر دەوترێ سروشیار واتە لەلایەنێکی نهێنییەوە سروشو ئیلهامی شیعری بۆدێو نوورو رووناکایی دەروونی هەڵدەگیرسێنێو وشە بەرخە شاراوەکانی دەردەهێنێو دەیکا بە شیعرو هەڵیدەڕێژێ ...

واتای دووەمی سروش ئەوەیە کە جۆرە وروژانو لەنگەرێکی تایبەتیو دووبارە بوونەوەی بێژەو هاوسەنگێتی وشەو گوتنکاری تێدەکەنو دەکەوێتە دەست بەیەکدا ولێنو هاتوچۆکردنو رێکخستنو ورتە ورتو لەم بارەشداو لەنێوانی هەردوو تەوری ئەندێشەو ئارەزووی بە کوڵداکانی گوزارەی دەتەقیو بیری روونـاك دەبێتەوەو هەموو بەهرەکانی رادەچەنو هەربیرەوەریو تاقیکردنەوەو ئەندێشەو سەلیقەو ئارامو وزەیەکیان هەبێ دەیخەنە بەردەستی شاعیر هەروەها هۆشیش لەم کارەدا بەشداری دەکات بەتایبەتی بۆ ئەوەی سەرنج بداو قسەی لێ بکاو بپرسێو ئامۆژگاری بکاو دابمرکێنێتەوەو بورووژێنێو جیا بکاتەوەو پاڵ پێوەنیر کۆکاتەوەو رێكو پێکییو رووناکیو یەکچوونی بچەسپێنێ ..

ئەم کارانەش هۆش خۆی نایانکات بەڵکو خۆی دەنوارێو بە ئێمەی دەکات ... بۆ ئەوەی زیاتر لەم بارەی سروش بکەین وا باشترە کە لە کۆمەڵێکدا گوێ لەو ئاخوندەیە بگرین کە چەپلەرێزانی خەلکەکە یا بەرەنگاریی بوونی هەندێکیان دەیوروژێننو سەرگەرمی دەکەن ... دەبینین وشەو بێژە وەکو کانی لە زاری هەڵدەقولێو بیروگوزارەش لە گەروویەوە شەپۆل دەدەن ... لە هەمان کاتدا دەیەوێ هۆشی بخاتە کارو قسەی هەڵەتو پەڵەت نەکاو لەباسەکە لانەدا ... هەرکە هاتەوە سەرخۆیو بارە سروشتییەکەی جارانی ئەوسا خۆی سەری لە قسەرەوانیو دەمو دووی خۆی سورِدەمێنێو عاجباتی لێ دێ ... ئانەلەو هەڵچوونو وروژانەوە گفتو گۆکەی لە هەموو ئالۆزیو گرێ کوێرەیەك دوور دەکەوێتەوەو دەگاتە ئەو پەڕی پلەی روونو ناسکیی ... بەکورتی ... شیعر : بەبێ هەڵچوونو وروژان ، جووڵانەوەیەکی دەروونی ، بۆ رێکخستنی جووڵانەوەی گوتار ، لەدایك نابێ ... هۆنراوە لە دەرەوەی دەروون دروست نابێو ناخولقێ خۆ ئەگەر وانەبێ ئەوە دەبێ شیعر دەربارەی یاری شەترەنجو بلیاردۆش بنووسین ... بەڵام نەء .. هۆشیش بەبێ ئارەزوویەکی بەجۆشو کوڵ بەتەواوەتی کاروبارەکانی خۆی ئەنجام نادات .

واتای سێیەمی سروش لە واتای یەکەمو

دووەم ناسکترو شاراوەترە .. چونکە ئێمە لەژیانی ئاساییماندا ئەو وشانە بەکار دێنین کە رەمزن بۆ شتەکان ... واتە بەجۆرێك کەڵکیان لێ وەربگرین ... ئەویش وەك بەکارهێنانی پارەو دراو بۆ کڕین و فرۆشتنی شت و مك ... بەڵام شاعیر وشە بەم جۆرە شێوازو رێبازە بەکار ناهێنێ ... چونکە ئەو وشە بۆ کەڵکێکی کارمەندانەیی بەکار نایەنێ بەڵکو بۆ ئەوەی کە لەو هەموو ئاوازو جۆشش و لەنگەرو خرۆشەی بێژەکان تابلۆیەکی روون و رەوان و دڵخۆشکەر دروست بکات ... گەورەترین دوژمنی شاعیر لە شیعر نووسیندا بەکار هێنانی ئاسایی وشەو بێژەکانە ... شاعیر دەبێ واتا رەمزیی و ئیمایی‌یەکان بەبەر وشەدا بکاتەوە ... واتاو گوزارە کۆن و رەسەنەکانی ئەو واتاو گوزارانەی کە لەو سەردەمەوە هەن کە خوا ئادەمی فێری هەموو ناوەکان کرد ...

**لەم بۆچوونەوە شیعر لە نوێژەوە نزیکە ... چونکە جەوهەرو کاکڵەیْ پوختی شتەکان هەڵدەبژێریْ بەو پێیەی کە خوا دروستی کردوون و شایەتی گەورەیی کردگارەکانیان دەدەن .**

– کلۆدێل – لەو جزمەی کتێبەکەیدا کە بەناونیشانی – پێشەکی‌یەك بۆ شعرێك دەربارەی دانتی – نووسیویەتی ... دووبارە باسی سروش دەکاتەوەو دەڵێ : سروشی هەڵبەست دوو بەهرەی بنەماو تایبەتی‌یان هەیە ئەویش ( وێنە )و ( کێش )ن ... وێنە : شاعیر وەکو مرۆڤێك پێشان ددەات کە بەجێگایەکی بەرزدا سەرکەوتبێ ... شاعیر لەو بارەدا ئاسۆیەکی فراوان دەبینێ و پەیوەندی تازەبابەت لەنێوان شتەکاندا بنیات دەنێ ... پەیوەندی‌یەك کە مەنتیق و یاسای بەرز دیاریی ناکات بەڵکو ئەوپەیوەندی‌یە دەسنیشانی دەکات کە واتایەکی لێپێکدێنێ ، بەکێشیش : زمان لە باروو دۆخ و قۆرت و پێچ و پەناو رێکەوت دەرباز دەبێ و بەهۆی گوێوە گوزارەو واتا دەگاتە هۆش و بەو جۆرە لەش و دەروون پێکەوە چەژی خۆشی و لەزەتی گوزارەکان دەکەن . هەروەها – کلۆدێل – لە مەسەلەی گرنگێتی و بایەخی هۆشەوە لەبواری داهێنانی شیعریدا بەسووری پێدادەکوتێ .. بەلای ئەوەوە بەهۆی هۆشەوە دەبێتە غەیبزانێکی بەتواناو پڕ لە پەیوەندیی و دۆستایەتی نەبڕاو ... ئەوەش بەهۆی گەڕان و شیکردنەوەی زۆرو بێ‌سڵەمینەوەو پرسیارو تاقیکردنەوەی بەردەمی بابەت و کەرەسەی شیعرییەکانی خۆی ... ئابەم شێوەیە شاعیر دەتوانێ جیهانە شیعرییەکەی خۆی بچەسپێنێ ... چونکە سروش بەتەنیا خۆی هیچ شتێك پێشکەش ناکات جگە لە وێنەی ناتەواوو خەونی ئاڵۆزو بانگاشەی کەفت و بێژەی ئاڵۆزو گرێچن .

**بەڵام شاعیر هەرگیز نابێتە کەلە شاعیر ئەگەر خەونە شیعرییەکانی کوو گشتی نەبن ... داهێنانی شاعیر دەبێ وێنەیەك و نیگایەك بێ لەسەرجەمی ژیان و بوون .**

ناوەرۆکی شیعریش وەکو دەڵێن ... تەنها هەر خەون و وڕێنەو بیرۆکە نیە .. بەڵکو ئەو راستی‌یە واقیعییە پیرۆزەیە کەپێمان بەخشراوەو ئێمەش لەناو جەرگەیدا این .

بەڵێ کاکڵەی شیعر جیهانی شتە شاراوەو بەنهانەکانە ، هەروەها جیهانی ئەو شتە بینراوو دیارانەیە کە گەمارۆیان داوین و دەمان بینن و دەیان بینین .

یەکێ لە بابەتە گرنگەکانی شیعری سەدەی رابوردوو : یاخی بوونە .. هەتا وەکو ستەم و زەبروزەنگ لەجیهاندا بمێنێ یاخی بوونیش وەکو هەستێکی قووڵ ، دەنگدانەوەیەکی فراوان و بەردەوامی لە دەروونی مرۆڤایەتیدا دەبێ ... هەست بەیاخی بوون کردنیش هەستێکی ئاسایی و رەوایە ... چونکە مرۆڤ مافی خۆیەتی و بۆی هەیە کە ئەگەر ئازارێکت پێگەیاند ... یا بەگژ یا جووی شتێك بڵێ کە بەرگری پێ لە خۆی بکا ... ئەگەر لە تەوراتدا باسی ئەیووب بخوێنینەوە دەبینین ئەیووب لەبارەگای خوادا ، دادو هاوارو ناڵەناڵ لەدەس ئەو زوڵم و زۆرە دەکات کە بەناڕەوا بەخەیان گرتووە ... کاتێکیش کە دۆست و کەس و کارەکانی سەرزەنشتی دەکەن و ئامۆژگاری دەکەن کەبەس دادو بێداد بکات ... خوای گەورە دەڵێ : ئێوە گەوجن ... دەلێگەڕێن بامرۆڤ بەئارەزووی خۆی کێشەی خۆی بخاتەڕوو . لەبەر ئەوە چاکترین هەڵبەستی سەدەی نۆزدەیەم ... شیعری یاخی بوون بوو . بەڵام یاخی بوونیش هەندێ سڵەمینەوەی هونەریی لێ ئەوەشێتەوە ... چونکە بەرەو هیچ شتێك ناتبات ... بەڵکو بەتەواوی لەو خاڵەدا بەجێتدێڵێ کە لەسەرەتادا تیابووی ... یاخی بوون سەر لێشێواوی‌یە لەبەر ئەوە کۆتایەکەی ناهەموارو تاڵبوو ... یاخی بوون تەنها سەرەو

بۆشایی پاڵمان پێوە دەنێ و ئیتر هیچی تر ... جگە لەوەش جوانترین بابەتی شیعر ئەو بابەتەیە کەوا دادەنرێ و دانانەکەشی پێویستی بە کۆمەڵێ رەگەزی دۆست و پەیوەست هەیە ...

**یاخی بوونیش بابەتێك نیە کە پێك بێد دابنرێ چونکە کارێکی واناکات کە شتەکان یەك بگرن و شتێك پێك بێنن ... بەڵکو ئامانجی سەرەکیی پرش و بڵاوکردنەوەو هەڵوەشاندن و ئاژاوە نانەوەو تەفرو توونا کردن و ویران کاری یە . هەروەها هاوارو ناڵەناڵی بەکوڵیش رەنگە کار لە دڵ بکەن و نەرمی کەن بەڵام هەرگیز یەکچوونییەك پێك ناهێنن ... !**

هەروەها دووبابەتی دیش هەن کە پەیوەندیان بە یاخی بوونەوە هەیە ئەوانەش - نائومێدی - و - گاڵتەبازی - ن - و شاعیرانی سەدەی رابوردوو زۆر لێیدواون و تیا کۆڵان ... دیسانەوە ئەم دوو بابەتەش هەروەکو یاخی بوون جێی رەخنەو بەربەرچ دانەوەن : نائومێدی بارێکی کاتی و سەرپێیەو زوو بەسەردەچێ و دەروونی مرۆڤایەتی خۆی لە خۆیدا زۆر شان بۆ نائومێدی شل ناکات ، بەڵکو هەمیشە روو لە هیواو ئاواتە ... روو لە خۆزگەو ئاسۆی فراوانە ... روو لەشتێکە کە پلەی بەرز بکاتەوە. گاڵتە بازیش ئەگەرچی هەندێ جار بەشێوەیەکی کەم ئاورو سەرنجی مرۆڤ رادەکێشی بەڵام ئەو کارتێکردنە کەم دەوامەو مرۆڤ زوو لێی بێزار دەبێ و پەناو هانا بۆ شتێکی پێویستتر دەبات . نابەو جۆرە ئێمە ناتوانین بەکەرەسەی یاخی بوون و نائومێدی و گاڵتە بازی و شتە نابەجێکانی تر ...

هیچ شتێك بنیاد بنێین ، بەڵام لەگەڵ ئەو بارەشدا سەدەی رابوردوو بەشێوەیەکی ساکارو سادەو ساویلکانەی دوور لە شاعیریەت خۆی لەقەرەی هەندێ بابەتی دیش داوە ... زانیایی ئێستا باوەڕی بەنەمریی دەروون نەماوە لەبەر ئەوە شاعیران ئەو بۆچوونەیان گۆڕیوە کە دەروون نامرێ و باسی نەمری لەش و گیان لەباو خۆڕو گوڵ و باڵدارانا دەکەن ... ئائەم بۆچوونە لەلای - کلۆدێل - ساکارە جگەلەوەی کە وەکو بابەتێکی شیعریش ساویلکانەیە ... چونکە بۆ نموونە ئەگەر هات و پەیکەری ڤینۆس برزێ و ببێتە کۆمەڵێ پارچە گەچ و مەرمەڕ ئەوا ئیتر ناشێ بوترێ ئەو کوچك و بەردانە پەیکەری ڤینۆسن

هەروەها گیانی مرۆڤیش لەدوای مردنی مرۆڤ هەرچەندێ لەشەکەی ببێتە خۆڵ و باو گوڵ ... ناشێ بوترێ ئەو خۆڵ و باو گوڵانە گیانی مرۆڤن ...

بابەتێکی تریش لەو بابەتانەی کە شاعیران دەربارەیان نووسیوە ( پێشکەوتن )ە ... ئەو پێشکەوتنەی کە بەتێوڕەکانی خەڵکی سەدەی رابوردووی سەرسام کرد ... شاعیران زۆر شیعریان پیا هەڵداوەو گەلێ هۆنراوەشیان سروشی ئەو پێی هەڵڕشتوون ... هەروەها لەلای چیرۆکنووسانی ئەو سەردەمەش پلەیەکی دیاری و تایبەتی هەبووە . ئەم بارو بۆچوونانە لە شیعردا سەرکەوتنی بەدی نەهێنا چونکە بیرۆکەی پێشکەوتن بەلای ئەوەدا دەچێ کەیەك دۆخ بدات بە هەموو ژیوەرو زیندەگانی ... ئەویش دۆخێکی کاتی و سەرپێیی کە ئەوەی لێ دەوەشێتەوە ئەنجامی کاتییەکان لە هەموو بابەخ و گرنگییەك بتەکێنێ ! ئائەم مەسەلەیەش وامان لێ دەکات کە بایەخی ئەو شتانەی نین بدەین بەسەر ئەو شتانەدا کەهەن ...

شاعیری راستەقینە پێویستی بەگەشترین ئەستێرەو جوانترین گوڵ نیە بۆ ئەوەی گەرووی گۆرانی بکرێتەوە ... بەڵکو تەنها بینینی هەر گوڵ و ئەستێرەیەك دەیخەنە گۆرانی وتن ... و ئەو ئەوە دەزانێ کە تەمەنی چەندێ درێژبێ هەر کورتەو ، دەسکردەکانی خوای کردگار زۆر شۆخن ... هەروا ئەوەش دەزانێ سروشت بۆچی لەسەر دووبارەکردنەوە بەردەوامەو لێی بێزار نابێ و هەموو ساڵێك هەمان گوڵ و هەمان زەمبەق پێشکەش دەکا ... شاعیریش هیچ پێویستی بەوە نیە کە چاوەڕێی ئەوە بکات پێشکەوتن جۆرە گوڵێکی تازەی بۆ دابێنێ بۆ ئەوەی شیعری پیا هەڵدات ... هەروەها - کلۆدێل - هەرچەندی لە لایەنگرە سەرگەرمەکانی هەڵبەستی نوێیە لە فەرەنسادا ... لەگەڵ ئەوەشدا لە کۆتایی لێکۆڵینەوەکەیدا دەربارەی شیعری فەرەنسایی دان بەوەدا دەنێ کە شیعری کێش و سەروادار لەشیعری سەربەست سەرنج راکێشترو هەستبزوێنترو مەبەست پێکترە ...

**سەرچاوەی باسەکە في الشعر الاوربي المعاصر للدكتور عبدالرحمن البدوي ، لاپەرە : ١١٤**




« بروسکەی نەورۆز » ناوی شیعرێکە لە ژمارە ( ٥٧٩ ) ی ڕۆژنامەی « هاوکاری »ی ڕۆژی ١٩ی مارتی ١٩٨١ بلاوکراوەتەوە .

خاوەنی شیعرەکە محەممەد ئەمین پێنجوینی‌یە .

لام وایە ، ڕەنگە ڕاستیش بێ ، کە ناوی « برووسکەی نەورۆز » سەرنج ڕاکێشەرێکی وانی‌یە کە خوێنەر چاوی پێبکەوێ تەشویقی بکا بۆ خوێندنەوەی ئەو دێڕانەی لەژێر ئەم ناوە ڕێزکراوون بۆ ئەوەی بزانێ شاعیر چی ووتووە .

هەروەها ناوی محەممەد ئەمین پێنجوینیش ناوێکی وا درەوشەدار نی‌یە لە ئەدەبی تازەی کوردی‌دا کە خوێنەر ڕابکێشێ بۆ ئەوەی بزانێ ئەم شاعیرە چی ووتووە ، چونکە تازە لاوەو هونەری شیعری نەیگەیاندۆتە پلەی ناوبانگی بەرز .

ئێمە لێرەدا نامانەوێ باس لە ڕستەی « برووسکەی نەورۆز » بکەین . چونکە بەتەنیا هیچ نادا بەدەستەوە . هەروەها نامانەوێ باس لە محەممەد ئەمین پێنجوینیش بکەین چونکە ئەوە باش دەزانین ، ئەگەر ئەم شیعرە شیعری « خراپ » بێ پێی ناکەوێ ، چونکە تەواوی شیعری شاعیرێك هەمووی لە خانەی شیعری « باش » دانانرێ ، بەلام ئەگەر شیعرەکە باش بێ بۆی حسێب دەکرێ ، لەگەڵ ئەوەی ئەم تاقە شیعرەش بڕیاری دووایی نادا بە تایبەتی بۆ شاعیرێکی لاو .

هەروەها نامانەوێ باس لەو وێنە دەسکردە دەبەنگەش بکەین کە هیچ پێوەندی‌یێکی بە شیعرو هونەرەوە نی‌یە ، نازانین بۆچ هاوکاری بە پالەپەستۆ خستوویەتی‌یە ناو ئەم شیعرەوەو هەندێ لە گۆڕەپانی خۆی پێ ڕەش کردۆتەوە .

هۆی نووسینەوەی ئەم چەند دێڕە ئەوە بوو ، یەکەم خوێندنەوەی شیعرەکە هەست بزوێن بوو ، زیاتریش ئەوەی هانی‌داین کە بکەوینە سەر هەوەسی تۆمارکردنی ئەو هەستونەستە ئەوە بوو کە بۆ هاوڕێمان شاعیری کورد محەممەد سالح دیلان خوێندرایەوە ، ئەویش ووتی : « شیعرێکی باشە » .

ئەم شیعرە لە ناوەرۆکدا بەهێزە ، بیرو وێنەو خەیالێکی یەکجار زۆری تێدایە ، ڕەنگە وەك « بەرنامە » یا « سەرە قەڵەم » کەرەستەیێکی باش بێ بۆ کارێکی لەمە گەورەتر ، لە قالبی شیعردا بێ یا پەخشان . ئەو بیرو ڕایانەی شاعیر دەیەوێ دەریان بخا ، شتێکی پیرۆزە ، لە خەیالا تازەیەو داهێنانی تێدایە ، بەلام ڕوخسارەکەی ، واتە قالبەکەی بتەو نی‌یە ، ئەمەش زیانی تێدا نی‌یە وەکو پرۆژەیێك ، چونکە مەرجی بنچینەیی « وێنەی خەیالی‌ی هونەری‌یە »، ڕاستە ئەمە دەبێ بخرێتە قالبێکی بتەوی هونەری ، بە « شیعر » بێ یا « پەخشان » ، بۆ ئەوەی کارە هونەری‌یەکە کامڵ بێ‌و هەموو جەوهەرەکانی هونەری بەرزی تێدا بێ . واتە بەلای ئێمەوە کەرەستەو تەکنیك سەرکەوتووە ، بەلام شێوەی دەربڕینی تەواو نی‌یە ، شیعرەکە کێشی هەیە ، بەلام هەندێ جار هەست

بەلاوازیی کێش یا « بێ کێشی » دەکرێ . واتە زۆرانبازی لەنێوان شیعرو پەخشاندا لەم شیعرەدا دیارە . ئەم دیاردەیە بێ گومان زیانی نی یە . چونکە هیواهەن ئەم « شیعرە پەخشانی یانە » بە هونەرێك دادەنێن کە پێویستە لە بەرهەمی ئەدەبیدا هەبێ . جا ئەگەر ئێمە دان بەو ڕایەدا بنێین دیارە دەبێ هەولیش بدەین کە بێتە ناو ئەدەبی کوردی یەوە .

ئێمە ئەوەش نازانین ئایا شاعیر بە ئانقەست ویستوویەتی شێوەی شیعرەکەی وابێ . یاخود ئەو هەر بەشیعری تەواوی دادەنێ ؟ بەلام ئێمە ئەوە دەزانین گەلێ شاعیری کوردیتر خەیالەکانیان خستۆتە ناو چووارچێوەی ئەو جۆرە شیعرەی کە « شیعری پەخشانی » پێدەلێین .

**نامانەوێ لە سەر ئەمە بڕۆین ، بەلکو مەبەسمان ناوەڕۆکی شیعرەکەیە ، بۆ ئەمەش تەنیا چمکێکی دەگرین .**

ئەمە بریتی یە لە هیواو ئامانجێك کاوەی ئاسنگەر ویستی بیهێنێتە دی ، بەلام تائێستا ئەم هیواو ئامانجە لە پەرەوازەدایە ، ڕۆژێك دێتەدیو بەلام زۆر ناخایێنێ لە چاو وون دەبێ . لێرە خۆی دەنوێنێ بەلام هەر چاو نوقاندنێکە تارمایی یەکەی دەتوێتەوەو لە جێگەیێکیتر سەر هەلدەداتەوە ، ئیتر کەسیش نازانێ کەیو لەکوێ جارێکی تریش خۆی پیشانی ئازادیخوازان دەدا .

شاعیر لە سەرانسەری شیعرەکەیدا خەریکی ئەو تەلیسمەیە کە ئازادیخوازان دەیانەوێ بیشکێنن . بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم دیاردەیە پەنا دەباتە بەر سامانی نەتەوایەتی لەمەدا ، دەچێتە لای شاعیری گەورەمان نالیی شارەزووریو دەلێ :

**سەدان سالە**

**ئێمە بۆنی نێرگس دەکەین ...**

**نالی دەلێ : « دو نێرگس هەر لە خەودایە » .**

دیارە لێرەدا مەبەستی نالی شتێکەو محەمەد ئەمین پێنجوینی بۆ شتێکیتر وەری گرتووە . ئەگەر نالی زۆر سەرکەوتوو بێ لەو مانایەی ویستوویەتی دەری بڕێ ، بێ گومان ئەم شاعیرە لاوەش سەرکەوتووە .

لە شیعرەکەی نالیدا ئەوە هاتووە :

**هەناسەم زولفەکەی لاداو مەیلێکی نەکرد چاوی**
**نەسیم ئەنگووتو شەو ڕابردو نێرگس هەر لە خەودایە .**

ئەمە خەیالێکی ڕۆمانتیکی ی ناسکە . نالی دەیەوێ خۆی لە حەبیبە نزیك بکاتەوە . دەمی بۆ ڕوخسارو غونچەی دەمی بباو هەنگوینی سافی بمژێ . شنەی هەناسەی قژوزولفی لە سەر دەم و چاوو ڕوخساری لادا . بەلام یار چاوی نەکردەوە . لە خەو هەلنەستا ... ڕوخساری حەبیبە ڕۆژە . بەلام هەلنەهاتبوو . قژوزولفی ڕەش داپۆشیبوو . واتە شەو بوو . لە شەویشدا پیاو دەنوێ بۆیە حەبیبەش نوستبوو .

کە قژوزولف لاچوو . بوو بە ڕۆژی ڕاستەقینە . بای شەماڵ هەلی کرد . شەو گەشتی خۆی تەواوکرد . بەلام حەبیبە لەخەو هەلنەستا . چونکە نایەوێ ئەو ماچە بدا بە نالی . .

شاعیری تازە ئەوە دەزانێ کە نێرگس « چاوە » . ئەم نێرگسەی لە نالی وەرگرتووە بۆ مەبەستێکیتر . لێرە بووە بە هیواو ئامانج . نالی هەموو زرووفێکی دروستکرد کە حەبیبە ئەنوێو ماچەکەی بداتێ . بەلام ئەو لەخەو هەلنەستاو ماچەکەی نەدایە . هەر وەکو شاعیری تازە کە دەلێ لەمێژە خەون بە بۆنی نێرگسەوە دەبینین . کەچی نێرگسەکەی ئێمە نوستووە وەکو چاوی حەبیبە .

ئەمە ئاوڕدانەوەیێکی هوشیارانەیە لە سامانی نەتەوایەتیو دۆزینەوەیێکی هونەروەرانەیە لە جیهانی داهێنانی شیعردا .

شاعیر هەندێ وێنەی تریشی لەم بابەتەوە هێناوەتەوە . هەمووی قسە هەلدەگرێ . بەلام جارێ با ئەوەندە بەس بێ .

شیعرەکە وەکو خەیالو ناوەرۆکو مەبەس پڕ ماناو سەرکەوتووە . بەلام وەکو زمانو ڕوخسارو وێنە ڕەنگە بەتەواوی لە قالبیدا نەمەیی بێ . ئەمەیان زانیاری یێکە شاعیر بە خوێندنەوەو لێکۆلینەوەو ووردبوونەوە لە شیعری کلاسیکی ی کوردیو شیعری بەرزی جیهانی دەتوانێ ببێ بە خاوەنی .

دووا ووشەم ئەوەیە . کە وادەزانم هەندێ دێری ئەم شیعرە لەکاتی بلاوکردنەوەدا لابرابێ . هەرچۆنێ بێ خاوەنی ئەم شیعرە شایانی پیرۆزبایی یە .

# «ئەو شاعیرانەی چیرۆك دەنووسن» و تەنگوچەڵەمەی رەخنەو لێکۆڵینەوە

صلاح شـوان

**لێشاوی ئەدەبی نوێمان وا بۆ دە ســـاڵ دەچێت بەرپابووەو تاکو ئیســـتایش کەفوکوڵی ئەگەر لە زیادیشدا نەبێت ، بەرەو نیشتنەوەیش نەچووە ، ئەمەیش بێگومان ســـەرەڕای ئەوەی دەورێکی ئێجگار گـەورەی لـە پەرەســـەندنی ئەدەبەکەماندا هەبووەو هەیە ، بـەڵام هەرگیزیش لە لایەنی بێسوودو ، بگرە تا زیانبەخشیش خاڵی نییە .**

یەکێك لەو لایەنە زیانبەخشـــانەی ئـەم لێشـــاوەیش نیمچە دیاردەیەکـە جاروبار بـە ئاســـتەمو ، هەنـدێك جاری تریش زۆر زەقو ناهەموار دەردەکەوێتو ، لـەو ئاومالکە دەچێت کە بەدەم ئاوێکی خوڕەوە هاتووبێتو ، هەنـدێك جار ئەوەندە پووشو پەلاشی بێرەگو ریشـــە لە خۆی کۆبکاتەوە ، کە مەترسیی ئەوەی لێبکرێت ئەو ئاوە خوڕە بپەنگێنێتەوەو لە ئاوەڕۆکـەکـەی خۆی دەریبکاتو بەلایەکدا بیبات زیانی لە قازانجی زیاتربێت ، بۆیە پێویستی بە پاککردنەوە هەبێت. ئەم نیمچە دیاردەیەیش جۆرە نووسینێکە جاروبار بە ناوی « رەخنە » و ، هەندێك جاری کەمتریش بە ناوی « لێکۆڵینەوە » وە بەرچاودەکەون .

**ئـەمجۆرە نووســـینە ئەگەرچیش رووی کردووەتە مەیدانی ئەدەب ، بـەڵام حەقیقەتەکەی ئەدەب نییـەو ، لـە ناچارییـە . چونکە ئـەدەب ئـەوەنـدە بـەربڵاوە دەکـرێت بـــە بیـانووی « ناوەڕۆك »ـەوە ئەو جۆرە نووســـینانە وا پیشانبدرێن کـــە دەربارەی ئەدەبن . زیاتریش لەبەر ئەوەی ئەدەبی هەندێك نەتەوەی‌تر لـەبـەر هۆی جیا لەمەی ئیستای ئێمە شتی وەهایان بـە خۆیانەوە دیوە ، بەڵام گشت ئەو رێیانەیش هـەر بۆ بانە دەچنو ، هەر لەیەك قولیشـــەوە رووی تێدەکەن ، کە ئەویش ئەرکی رۆژانەی ئەدەبو ، ئاراستەکردنێتی بۆ خزمەتی ئەو فیکرەی ئـەوان بانگی بۆ هەڵدەدەن .**

تەنانەت لە هەندێك شوێنو کاتیشدا ئـەم بۆ چوونانە وایان لە ئەدەب ویســـتووە ببێت بـە سوخرەکێشێکی بێدەستەڵاتو کەرەســـتەیەکی بێکیانی پروپاگەندە ، بە مەیش ئەدەبی هەندێـك لەو نەتەوانەی تووشی ئەم دەردە هاتوون ، وایان لیهاتووە بە چەندین قۆناغ لـە پلەکەی پێشوویان







دوا بکەون. ئەدیبە ڕەسەکانیشیان تووشی بارێکی دوو سەرەی ناهەمواربوونە : یان مۆری ناپاکی پێوەنانو پاراستنی داهێنانەکانیانو ، یانیش سەرشۆڕکردن بۆ « توانەوە »و نووسین بە پێی پێوانەو کێشانە بەزۆر سەپێنراوەکان . کە ئەمیشیان بەلای زوربەیانەوە ئەوەندە گرانبووە پێیان نەچووەتە سەرو ، زیاتریش هەر بە خۆ لەناوبردن لەو دەردە رزگاریانبووە(١) .

بۆیە ئەم دیاردەیەی لای خۆمان شتێکی سەیرو دەگمەن نییە ، بەلام دلنیام ئەم کردەوەیە لەگەل ئەدەبەکەی ئێمەدا ناگاتە ئەم رادەیە ، چونکە ئاوو هەوای ولاتەکەمان بۆ رەگداکوتانی گشت رووەکێك دەستنادات ، بە تایبەتیش ئەگەر دڕکو داڵێكبێت بە دەم بایەکی ناوەختەی لەدوورەوە هاتووەوە هاتوبێت .

بێگومان من لێرەدا مەبەستم نییەو ، ناشکرێت گشت لایەنێکی وەها دیاردەیەك روونبکەمەوەو ، چارێشی بۆ دابنێم ، چونکە ئەمە کاری تەنیا کەسێكو ، تەنیا نووسینێکی وەك ئەمەی من نییەو ، کاروانی ئەدەبەکەمان بە رەسەنایەتیی خۆی دەتوانێت – زوو یان درەنگ – چارەسەری بکات . بۆیە من هەر تەنیا گۆشەیەك دەگرمو ، ئەوەندەی لە بارمدا هەبێت روونیدەکەمەوە .

**● ئاشکراترین مۆرکی ئەم دیاردەیە مەسەلەی فیکرە لە ئەدەبدا ، کە بێگومان مەسەلەیەکی بێبایەخو کەم نییە ، بەلام بیگومانیشە کە دەوترێت فیکر لە ئەدەبدا ، پەیوەندیی ئەم دوو لقەی رۆشنبیری تا رادەیەك دەستنیشان دەبێت ، کە ئەویش مەسەلەی فیکرە وەکو بەشێك لەو گەرمستانەی ئەدەب بۆ زیاتر خۆ بەهێزکردن بەکاریدەهێنێت .. ئەمە رێك وەکو ئەوەیش وایە بوترێت : کۆمەلایەتی لە ئەدەبداو ، دەروونناسی لە ئەدەبداو ، ئاین لە ئەدەبداو ، فۆلکلۆر لە ئەدەبداو .. هتد . واتە لێرەدا گشتەکە ئەدەبەو ، ئەوانیتر بەشو لقە بەشن ..**
باوەڕیش ناکەم پێویست بکات بلێین لقو بەش هەرگیز ناشێت لەم مەسەلانەدا جێگای گشتەکە بگرنەوە بەبێ ئەوەی گشتەکە بشێوێت ، یان ببێت بە شتێکیتر .. بۆ نموونە با بلێین : ئەگەر هاتو دەروونناسی لە ئەدەبدا بوو بە گشت شتێکی ئەدەبەکە ، ئیتر ئەدەبەکە لە ئەدەبی دەکەوێت ، ئینجا نووسینەکە با کێشو قافییە ، یان مەنەلۆجو دیالۆجیش تیا بێت .. ئەمە دەربارەی کۆمەلایەتیو زانستو فیکرو گشت لقەکانیتریش لە ئەدەبدا هەر وەهایە ، واتە ئەگەر ئەدەب تەنها وەکو فیکر ، یان هەر یەکێك لە بەشو لقەکانیتری سەیرکرا نرخە ئەدەبیەکەی نامێنێتو لە ئەدەبایەتی دەکەوێتو ناشبێت بەوانەیش . هەروەهایش ناشێت پێودانگەکانی ئەدەب بەسەر یەکێك لەوانەدا بسەپێنین ، با بۆ روونکردنەوەی مەبەستەکانی خۆی پەنایشی بردووبێتە بەر ئەدەب .. بۆ نموونە « فرۆید » لەگەل ئەوەیشدا زۆر لە تیۆرەکانی لە رێگای ئەدەبەوە ساغکردووەتەوە ، بەلام نووسینەکانی هەرگیز نەبوونە بە ئەدەبو هەر بە دەروونناسی ماونەتەوە. یان « زەرادەشت وای وت »ی « نیتشێ »ی فەیلەسووف ئەگەرچیش لە شێوەی چیرۆك یان رۆماندا دارێژراوە ، بەلام هەرگیز لەسەر ئەدەب دانەنراوەو ئەگەر وەکو ئەدەب سەیربکرێت لە بەرهەمی ئەدیبێکی تازە پێگەیشتوو زیاتر نابێت .

ئەمانە بەدیهیەنو . هەر بۆ بیرخستنەوەو سوود لێوەرگرتن لەم نووسینەدا دەیانخەینە پێشچاو . ئەگینا باوەڕناکەم کەس هەبێت ئەوەندە خۆی گێلبکات داوا لە بولبول بکات ئەردە گەنمی بۆ هەلبگرێتو دەنگخۆشیشی لە گوێدرێژ بوێت !

**● پەیوەندیی نێوان ئەدەبو فیکر پەیوەندییەکی – زیاتر لە گشت شتەکانیتر – پڕ کێشەبووەو ، هەر لە سەرەتاوە بگرەو بەردەی زۆری لەسەرکراوەو دەکرێت . چونکە مەسەلەکە کێشەی نێوان دوو لای بەهێزو قوولو فراوانی رۆشنبیرییەو ، هەر لایەیش شۆڕە سواری خۆی هەبووە داکۆکیی لەسەر بکاتو ، هەولبدات ئەو لایەکەی تر بۆ سوودی خۆی دەستەبەر بکات .**



شێرکۆ بێکەس

**بە تایبەتیش لەبەر ئەوەی هەردوو زیاتر هەر یەك کەرەستە بۆ بەدیهێنانی مەبەستەکانیان بەکاردەهێنن ، کە ئەویش زمانە .**

بەلام لەبەر ئەوەی ئەدەب هونەرەو ، هونەریش لە رووی کاتەوە زۆر پێش فیکرو فەلسەفە کەوتووەو ، فراوانترو قوولتریش رەگی لە ناخی مرۆڤایەتیدا داکوتاوە ، بۆیە فیکرو فەلسەفە بۆ چەسپاندنی چەمکەکانی خۆی پەنای بردووەتە بەر ئەدەبو ، هەر کە ئەدەب بە هانای نەهاتووبێتو لە قالبەکانی فراوانتربووبێتو پەلوپۆی بلاوتر هاویشتووبێت، فیکر ویستوویەتی بە جۆرێك ئاراستەی بکات بشێت ببێت بە کەرەستەیەك بۆ چەمکەکانی .

لێرەیشەوە کێشەیەك سەری هەلداوە کە زیاتر کێشەی نێوان دەستەمۆکەرو دەستەمۆنەبوو بووە . تەنانەت ئەم کێشەیە لەلای هەندێك لە خاوەنبیرانو فەیلەسووفە وشکەکان بووە بە هۆی پێکدادانو سارده جەنگ . بۆیە دوو هەزار سال زیاترە « ئەفلاتوون »ی فەیلەسووف هیچ چارێکی نەماوە لەوە زیاتر کە شاعیران لە کۆمارە داتاشراوە هەرگیز بەدینەهاتووەکەی دووربخاتەوەو . وەرزشەوانەکانی لەوان پێ پەسەندتر بێت ، نەك تەنها لەبەر ئەوەی وەرزشەوانەکان لە شاعیران بە پیلو بازوو و بەکارترن ، بەلکو لەبەر ئەوەیش شاعیران بیرو هۆشی خەلکیش وا لێدەکەن بە یاساو و رێزیمی کۆمارەکەی دانەکەون . .

« چیخۆف »یش وەکو ئەدیبێکی داهێنەری مەزن لەم بکرەو بەردەیەدا بەشداریی کردووەو دەلێت : « فیکر بدەرە لاوە . . چ سوودێکی هەیە ؟! ئێمە پێویستە لەسەرمان راستگۆیانەو دلسۆزانە دەربارەی ئەو شتانە بنووسین کە دەیانبینینو هەستیان پێدەکەین »(٢) . ئەم وتەیە بە دەمی پالەوانی بەرهەمێکەوە نەوتراوە تا بلێین مەرج نییە رای نووسەرەکە خۆی وابێت ، بەلکو

لە گفتوگۆیەکدا دەربارەی ناوەرۆکی چیرۆك وای وتووە . ئاشکرایشە « چیخۆف » ئەدەب بە زادەیەکی رەسەنی ژیان دەزانێتو ، لە کاروباری ئەقلیی رووت جودای دەکاتەوە . بەلام هەر بە بۆچوونە هونەرییەکەی خۆی لێکیشیان دانابڕێتو ، خاوەنبیرو فەیلەسووفان لە دنیاکەی خۆی دەرناکات ، چونکە دەزانێت ژیان لەوە فراوانترە لە جێگای یەك لا زیاتری تیا نەبێتەوە . ئەمەیش جیاوازیی نێوان بۆچوونی بەر بلاوی پەلکەرەنگینە ئاسای ئەدەبو ، بۆچوونی وشکی لە قالب دراوی فەلسەفەیە ، بۆیە دەلێت : « من چونکە دەژیمو بیردەکەمەوەو لە کێشەو ئەندێشەدام ، دیارە گشت ئەو شتانە لە نووسینەکاندا رەنگدەدەنەوە ، ئیتر ئەگەر نووسەرێکی بەهرەمەندبم چ پێویستییەکم بە وشەی ( فیکرە ) و ( نموونە ) هەیە ؟ خۆ من نە مامۆستاو نە شێخو نە پیاوی پروپاگەندەنیم . من راستگۆیانە وێنەی ژیان دەکێشم »(٣) .. ئینجا ئەگەر بزانین هەردوو وشەی « فیکرە » و « نموونە » وشەی « ناوەرۆك »ی ئێستا دەگرێتەوە ، بە تەواوی مەبەستەکەمان بۆ روووندەبێتەوە .

**بەلای منەوە گشت ئەدیبێکی رەسەن**

عبدالله عباس



**ئەگەر وایشی نەوتووبێت ، بە ئەدەبەکەی هەر ئەمەی چەسپاندووە ، چونکە وەکو چۆن هیچ ئەدیبێك فیکرێکی دانەرشتووە ، ئەوهایش هیچ فیکرێك ئەدیبێکی رەسەنی دروستنەکردووە .**

بەلام ئەمە هەرگیز ئەوە ناگەیەنێت ئەدیبە رەسەنەکان سەر بە هیچ فیکرێك نەبن و ، کەم تا زۆر تەعبیر لەو فیکرەیش نەکەن کە باوەڕیان پییەتی . ئەگەر چیش زۆر جار هەبووە ئەدیبێك سەر بە فیکرێك بووەو بە ئەدەبەکەیشی شتێکی تری دەربڕیوە ، باشترین نموونەی ئەمەیش « بەلزاك »ی سەر بە مەلیك و دارو دەستەتەکەیەتی ، کە بە ئەدەبەکەیشی روونترین شێوەی کێشەی نێوان رەنجدەران و چەوسێنەرانی کێشاوە ...(٤) « یەسینین »یش دەربارەی خۆی بەدەم گۆڕ هەلکەنێکەوە دەلێت :

**لە ژیانیدا کەم بەدمەستیی نەکردووە**
**بەلام هەرگیز نەیتوانیوە**
**پێنج لاپەڕە .**
**لە « سەرمایە » بخوێنێتەوە(٥) .**

ئینجا ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە ئەوەیە هەندێك لەو نووسەرانەی ئەو جۆرە بە ناو رەخنەو لێکۆلینەوانە لای خۆمان دەنووسن بە خۆیان بزانن و نەزانن لە دانیشتوانی کۆمارێکی وەك ئەوەی « ئەفلاتوون »ن و ، دەیانەوێت ئەو ئەدەبەی لە قالبەکانیان زیاتر بەلوپۆی هاویشتووبێت و لەگەل رێژیم و پەیڕەوەکانیاندا نەگونجێت ، کۆمار بەدەرو ریسوای بکەن جا بە هەر شێوەیەك و بە هەر نرخێك بێت .

**● خالێکی تری گرنگیش لەم دیاردەیەدا مەسەلەی ناوی « رەخنە »و « لێکۆلینەوە »یەو ، ئاشکرایشە ئەم دوو وشەیە لە ئەدەبەوە هەلقولاون و بەشێکن لێی ، رەخنەگرانیش هەمیشە بەوە رێزی خۆیان لە دلی ئەدیبان و خەلکیشدا چەسپاندووە کە شارەزایەکی تەواوی ئەدەبی زەمانەکەی خۆیان و پاشانیش گشت ئەدەبی جیهانی بوونەو ، بە تەواوی سەریان لە هونەرەکانی ئەدەب و وردەکارییەکانی بەرهەمی ئەدەبی دەرچووە، ئینجا سەرەڕای ئەمەیش رۆشنبیرێکی هوشیاری گشت کوڕەکانی تری رۆشنبیری بوونە . ئەوەی لە هەندێك لەو رەخنەو لێکۆلینەوانەدا دەبینرێت کە من لێرەدا مەبەستمە، ئەوەیە هەرە چاکەکانیان باسی گشت شتێکی تیایە تەنها ئەدەب نەبێت ! خۆ ئەگەر بلێین پەنا دەبرێتە**




**بەر گشت ئەو شتانە بۆ تیشك خستنە سەر ئەدەبەکە ، وەهایش نییە . بەلکو بە پێچەوانەوە ئەدەبەکە تەنها کەرەستەیەکی بە سوخرە گیراوە بۆ ئەو مەبەستانەی‌تر ، جا رەوابن یان نارەوا .**

بەلام هەندێکی‌تری - وەکو لەم نموونەیەی دەیخەینە پێش‌چاو - لە چەند کلیشەو وتەیەکی سواو زیاتر ، کە وەکو قەوانی شکاو دووبارە دەبێتەوە ، هیچی‌تری تیا نییە .

ئەمەیش دیاردەیەکە کۆمەلێك هۆی جیاجیای هەیە ، لە سەرووی هەمووشیانەوە ئەوەیە « نان بۆ نانەواو گۆشت بۆ قەساب » لەم سەردەمە جەنجال و زۆر لایەنەدا کە زیاتر پێویستی بە خۆتەرخانکردن هەیە ، باوی نەماوەو ، هەندێك لە قەسابەکان لەبەر هەر هۆیەك بێت بە خۆیان و کێردەکانیانەوە روویان کردووەتە تەنووربانە سپییەکەی ئەدەبەکەمان و بە شێوەکەی پێشووی خۆیان رەفتار لەگەل نانی ئەدەبەکەماندا دەکەن .

* * *

**دوای ئەم پێشەکییە گشتی و یێجگار کورتە حەزدەکەم چەند خالێك دەربارەی ئەم نووسینەی خۆم بخەمە پێش‌چاو :**

١ - بە شێوەیەکی گشتی بەرپەرچەکانم بە پێی ریزی نووسینەکەی نووسەر دەبێت ، جا لەبەر ئەوەی ئەو هیچ مەنهەج و هێل و گونجاندێکی بەکارنەهێناوە ، بۆیە ئەمەی منیش تەنها بریتییە لە چەند خالێکی جیاجیای لێرەو لەوێ .

٢ - شیکردنەوەی ئەو چیرۆکانەی نووسەر باسی کردوون و خۆدان لە لایەنە هونەرییەکانیان زۆر بە کورتی و بە شێوەیەکی گشتییەو ، هەر تەنها بۆ دەرخستنی




راستی‌و ناراستی‌و روونکردنەوەیە .

٣ ـ بە پێی توانا هەولم‌داوە بۆ چوونەکانی خۆم بە وتەو نموونەی گەورە ئەدیبانی دنیا پالپشت بکەم ، بۆ ئەوەی نەوترێت منیش قسە لە گیرفانی خۆمەوە دەردەهێنم‌و ، بە پێی بۆچوونی نەشارەزایانەی خۆم شتەکان لێکدەدەمەوە .

٤ ـ دوایی‌ش ئەم گفتوگۆیە خاڵ بە خاڵ‌و هەنگاو بە هەنگاوی نووسینکەی نەگرتووەتەوە ، بەلکو زیاتر شتە سەرەکی‌و زەقەکانی گرتووەتەوە .

* * *

**ئینجا با بە نموونەیەکی بچووکی لەو جۆرە رەخنانەدا بچینەوە ، کە ئەویش نووسینێکی « حمە سعید حسن »ـە بە ناونیشانی « ئەو شاعیرانەی چیرۆك دەنووسن »(٦) .**

● بەر لە گشت شتێك ئەوەندەی من ئاگام لێبێت ئەم ناونیشانە پرۆژەیەکی چیرۆکنووس کاك « رەئووف حەسەن » بوو ، لە کاتی خۆیدا هەندێك سەرنجیشی دەربارەی ئەم پرۆژەیە بۆ من‌و چەند هاورییەکی تریش باسکردووە .. بەلام هەرگیز سەرنجەکانی ئەو لەم نووسینە نەدەچوون .

● « حەمە سەعید » پاش سەرەتایەکی کورت دێتە سەر « کۆمەلێ لەو چیرۆکانەی لە دوای ١٩٧٠ وە بلاوکراونەتەوەو نووسەرەکانیان شاعیرن »(٧) . یەکەم کەسیش کاك « دلشاد محەمەد ئەمین »ی شاعیرو چیرۆکنووسی هەلبژاردووەو . هەر خۆیشی دەلێت : « دلشاد شاعیرە بەلام چیرۆك نووسێکی بە تواناشە » .

کەوابوو کاك « دلشاد » لەو شاعیرانە نییە کە جاروبار چیرۆکیش دەنووسن ، بەلکو سەرەرای شاعیرییەکەی چیرۆکنووسیشەو ، بە پێچەوانەی ئەوانی تریشەوە دوو کۆمەلە چیرۆکیشی بە ناونیشانی « بەپەنجەکانم دەتبینم » و « دێر یاسین » لە چاپداوە ، ئەمە لە کاتێکدا هەندێك لە چیرۆکنووسەکانیشمان ئەمەیان نییە . بەمەیش لەوانی‌تر جودا دەبێتەوەو ، ناکەوێتە ژێر ناونیشانی نووسینەکەوە .

● نووسەر یەکەم چیرۆکیش « بووکە خان »ی هەلبژاردووە ، کە کاك « محي الدين زەنگنە »یش لە ژمارە « ٤٥ »ی گۆڤاری « رۆشنبیری نوێ » دا کورتە رەخنەیەکی بە زمانی عەرەبی لەسەرم ئەم چیرۆکە نووسیوە لەگەل چوار چیرۆکی‌تردا ، کە لە ژمارەی پێشووی ئەو گۆڤارەدا کرابوون بە عەرەبی‌و بلاوکرابوونەوە(٨). « حەمە سەعید » ئەگەرچی هەر ئەو شتانەی کاك « محي الدين زەنگنە »ی بە سەرو گوێ شکاوی ، یان بە ئاوەژووکراوی وتووەتەوە کەچی هیچ پەنجەیەکی بۆ ئەو نووسینە درێژنەکردووە !

● ئاشکرایشە ئەوەی کاك « محي الدين زەنگنە » ناوی « انطباعات سريعه »ی لێناوە زۆر وردترو قوولترو ، تا بە قەوارەیش لەمەی ئەم زیاترە کە ناوی « لێکۆلینەوە »ی لێناوە !

● جگە لەمانەیش « حەمە سەعید » ئەو چیرۆکە وەکو چیرۆکێکی پەروەردەیی لە قەلەم دەدات ، بەمەیش گیانی چیرۆکەکە ـ کە درامایییەکەیەتی ـ لە ناخەوە دەردەهێنێت ، ئەمە بەلای خۆیەوە پێیاهەلداوە !

● « حەمە سەعید » رای وایە کە « یەکێ لە مەرجەکانی چیرۆکی سەرکەوتوو ئەوەیە تا ماوەیەکی دوورو درێژ لە یادی خوێنەر ناچێتەوە » .. بێگومان ئەمەیش لایەنی کارتێکردن‌و تام‌و لەزەت‌و دەروون ورووژاندنەکەی هونەر دەگرێتەوە ، کەچی هەر خۆیشی دەمێك نییە بەوە تانە لە کاك « سامی فەتاح » دەگرێت کە وتوویەتی : « شیعر لەززەتێکە لە سەرووی هەموو لەززەتەکانەوە »(٩) . قەیدی چییە . شتێکی چاکە چیرۆك‌و گشت هونەرەکانی تریش ئەم لایەنە بەدی بهێنن ، بەلام ئەمە هەرگیز مەرجی چیرۆکی سەرکەوتوو نییەو ، دەشێت

چیرۆکی وا هەبێت کە دەستت داپێ تا تەواوی نەکەیت وازی لێنەهێنیت‌و کەچی نەچیرۆکی چاك‌و نە سەرکەوتوویش‌بێت . جگە لەوەی ئەم مەسەلەیە پەیوەندیی بە کۆمەڵێك لایەنی هونەری‌و فیکری‌و دەروونی‌و رۆشنبیری‌و کۆمەڵایەتی‌و .. شتی‌ترەوە هەیەو ، بەلای هەرکەسەوە بە جۆرێکە . بۆ نموونە چیرۆکە پۆلیسییەکانی « ئەجاسا کریستی » لەو چیرۆکانەن کە رەشە خوێنەر هەر ئەوەندەی دەستی داپێ تا تەواوی نەکات وازی لێناهێنێت‌و ، لە بەرهەمی تێکرا گشت گەورە ئەدیبانی ئەم جیهانەیش لەناو زوربەی خوێندەوارانـدا بلاوترن . چیرۆك‌و رۆمانەکانی « فرانسوا ساگان »یش لە فەرەنسادا لە گشت ئەوانی‌تر زیاتر دەخوێنرێنەوە . رۆمانی « العراب »ی « ماریۆ پۆزۆ »یش تا ئیستا زۆرترین دانەی لێ‌چاپکراوەو فرۆشراوەو،رەنگە هەرگیزیش لەبیری هیچ خوێنەرێك نەچێتەوە ، بەلام ئەمانە لەگەڵ ئەوەیشدا هیچ نرخێکی ئەوتۆی نە ئەدەبی‌و نە هونەری‌و نە فیکری‌و نە هیچی تریان نییە . بە پێچەوانەیشەوە زۆر لە شاکارە جیهانییەکان هەن بە کەم کەس دەخوێنرێنەوە ، وەکو رۆمانی « گەڕان لە کاتە ونبووەکە »ی « مارسێل پرۆست » و رۆمان‌و زۆربەی چیرۆکەکانی « جێمس جۆیس »و چیرۆك‌و رۆمانەکانی « ئالان رۆب – گرێ »و..زۆری تریش . ئەمە سەرەڕای ئەوەی هەر لە بنەڕەتدا کەم کورتە چیرۆك هەیە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ لە بیری خوێنەردا بمێنێتەوە ، چونکە کورتە چیرۆك وەکو چەشن خۆی ئەو توانایەی زۆر کەمەو ، ئەم قسەیە تۆزێك زیاتر بۆ رۆمان دەستدەدات .

نووسەر بۆ نموونەی ئەم قسەیەی « کوێرەوەری »(١٠) دەهێنێتەوە .. ئەوی راستی‌بێت من بۆ ئەم نووسینە بەو چیرۆکەدا چوومەوە ، بەلام کەس سوێندی لەسەرم نییە ، تا تەواوم‌کرد چوار پێنج جار لاپەڕەکانیم هەڵدەدایەوە بۆ ئەوەی بزانم چەندی ماوە تەواوبێت . من ناڵێم ئەو چیرۆکە لە کاتی خۆیدا پڕ بە پێستی سەردەمەکەی نەبووە ، بەلام ئیستا « تەنها چمکێکە لە مێژوو ، و مەگەر بایەخی سەرەکی چیرۆکەکە لەمەدابێ . دەنا ئەو واقیعە ئیستا نموونەی نەماوەو ئەگەر مابێتیش شێوەیەکی زۆر جیاوازی وەرگرتووەو تەواو گۆڕاوە »(١١) . ئەم وتەیەی کاك « حسین عارف »لێرەیشدا پڕ بە پێستێتی . دەربارەی ئەو جۆرە شێوەیەیش کاك



« محي الدين زەنگنە » دەربارەی چیرۆکی « خازێ »(١٢) کە هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ « کوێرەوەری »دا نییە ، دەڵێت: «..نموونەیەکی دواکەوتووی نووسینە .. تەنها ئەو مێژووەی هەڵیگرتووە ، ئەگەر بە هانای بێت ، وای لێدەکات ناوی چیرۆکی لێبنرێت .. چونکە سەر بەو سەردەمەیە کە هێشتا سنووری نێوان چیرۆك وەکو هونەرو ، چیرۆك وەکو وتارێکی ئینشای ( اصلاحی ) روون نەبووبووەوە »(١٣) .

بەمەیشدا دەردەکەوێت « حەمە سەعید » بە چێژو بە بۆ چوونیش لەگەڵ ئەو هەنگاوە پێشکەوتووانەی ئەمڕۆی هونەری چیرۆکنووسین‌و بگرە ژیانی پێشکەوتوویشدا نییە ، بۆیە هیچ نموونەیەکی نوێ ، یان ئەمری نەهێناوەتەوە . هێنانەوەی ئەم نموونەیەیش دبارە پەنجە درێژکردنێکە بۆ نووسینی چیرۆکی وەها ، کە « .. لە ئاستی تەکنیکی تازەدا ئەو بایەخەی نەماوەو بەکارهێنانی لە ئیستادا جۆرێکە لە دواکەوتن لە کاروان »(١٤) .

**● « حەمە سەعید لەمسەر تا ئەوسەری نووسینەکەیدا ئەوەندەی پێی‌بکرێت خۆی لە لایەنە هونەرییەکانی چیرۆکەکان پاراستووە ، بەلام لەگەڵ ئەوەیشدا کە بە چەند قسەیەك ئەم چیرۆك بە سەرکەوتوو و ئەوی‌تر بە سەرنەکەوتوو لە قەڵەم دەدات ، بەبێ ئەوەی بە هیچ بەڵگەیەك ئەو رایانەی بچەسپێنێت ، یان ئەو سەرکەوتن‌و نەکەوتنە دەربخات .. دەڵێم لەگەڵ ئەوەیشدا – وەکو لەمەودوا روونی‌دەکەینەوە – لە زوربەی بۆچوونەکانیدا بەهەڵەداچووە .**

بۆ نموونە دەربارەی چیرۆکی « محازرەیەك

دەربارەی کورتە چیرۆکو سۆ وەت »(١٥) دەڵێت:
« .. ئەو شێوە تەکنیکەشی دلشاد فیکری چیرۆکەکەی پێدەربڕیوە شێوەیەکی تازەی تایبەتە بە دلشادو .. هتد » . کامە شێوە تەکنیك ؟ سیمای ئەو شێوەیە چییە ؟ کامانەن ئەو بناغە تەکنیکیانەی کاك « دلشاد » چیرۆکەکەی پێدەربڕیوە ؟ تازەیی‌و تایبەتییەکەی لەچی‌و لە کوێدایە ؟ .. هتد . نووسەر خۆی لە هیچ یەکێك لەم پرسیارانە نەداوە . بۆ نموونەی بە هەڵەدا چوونەکانیشی ، سەرەڕای ئەوەی دەربارەی درامییەتە بە پەروەردەیی کراوەکەی چیرۆکی « بووکە خان » وتمان ، لێرەیشندا کە بە « .. سۆ وەت » دا زیاتر لە « بووکە خان » هەڵدەدات ، هەر بە هەڵەداچووەو رایەکەی بە پێچەوانەوەیە ! چونکە « ... سۆ وەت » جگە لەوەی هەمووی بە « دیالۆگ » دارێژراوە ، تەنها چەند دێرێکی سەرەتاکەی‌و کۆتاییەکەی نەبێت ، سەرەتاکەیشی تووشی ریپۆتاژکاری هاتووە ، بەوەی باسی هونەری کورتە چیرۆك دەکات ، ئینجا با چیرۆکەکە بە دەمی مامۆستایەکەوە بێت‌و ، با جێگایش ژووری موحازەرەیەکی کۆلێجێك‌بێت. کاك « دلشاد » خۆیشی هەستی بەمە کردووەو لە ناونیشانەکەیدا ئیشارەتی داوەتێ کە نووسیویەتی: « محازەرەیەك دەربارەی کورتە چیرۆکو ... » . بەڵام « بووکە خان » : « بینایەکی هونەریی کۆکی هەیە .. چونکە هۆ ئەنجامی لێدەبێتەوەو .. ئەنجامیش دەبێتەوە بە هۆ بۆ ئەوەی ئەنجامێکی‌تری لێببێتەوە ، بەمجۆرە حیکایەتی چیرۆکەکە لە چوارچێوەی پەیوەندییەکی پەرەسەندنانەی جەدەلییانەدا بە ریچکە درامییە توندو تیژەکەیدا دەڕوات .. تا دەگاتە ئەنجامەکەی .. »(١٦) .

* * *

● **نووسەر هەرچەند خۆی لە قەرەی ، لێکۆڵینەوەو ، رەخنەی ئەدەبی نەداوەو ، زیاتر هەر پەنای بردووەتە بەو قسانەی کە زیاتر بۆ دەزگاکانی راگەیاندن‌و کاری رۆژانەی ئاراستەکراو دەستدەدەن ، نەك بۆ ئەدەبێکی ئەمرو بە پێز .. بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا کارەکەی بۆ نەچووەتە سەرو ، لە هەر شوێنێکدا زانیبێتی راستیی بەرهەمەکان لەگەڵ بڕیارە پێشوەخت دراوەکانی خۆیدا ناگونجێن ، دەستی کردووە بە بۆ هەڵبەستن ـ وەك لێرەداو دواییش روونی‌دەکەینەوە ـ ، دیارە ئەمەیش بە مەبەستی زڕاندنی ناوی هەندێك لەو ئەدیبانەیە .**

● نووسەر دەربارەی چیرۆکی « کڵاو قووچ »(١٧)ی کاك « شیرکۆ بێکەس » ئاوەها دەستپێدەکات : « ئافرەتێکی قەیرە کە ( شزوزی ! ) هەیەو بۆ دامرکاندنەوەی ئالۆشەکەی پەنا دەباتە بەر پشیلەش .. هتد » . من لێرەدا داوا لە خوێنەران دەکەم بگەڕێنەوە سەر ئەو چیرۆکەو ، جارێك‌و دوان‌و دەیش بیخوێننەوەو بزانن ئەم قسەیە راستە یان وەك وتمان بۆ هەڵبەستنە . بۆ ئەوەی خۆیان بڕیار لەسەر نیازی نووسەر بدەن لەم قسەیەی .

نازانم « باجی ئامە »ی قوربانیی دواکەوتن‌و نەخۆشیی ئاوەڵە دەبێت چ ( شزوز )ێکی هەبێت ئەگەر حەزبکات وەکو گشت ئافرەتانی ئەم دنیایە شووبکات‌و، ببێت بە دایك‌و دەورە سروشتییەکەی خۆی لە ژیاندا بگێڕێت ؟ خۆ ئەگەر بایەخدانەکەیەتی بە پشیلەکە ، کە بۆ پڕکردنەوەی بێ منداڵییەکەیەتی ، ئەوە ئاشکرایە هەرگیز وەکو سەگەکەی چیرۆکی «سمك طري»ی چیرۆکنووس « جليل القيسي » بۆ کاری سێکسی بەکاری نەهێناوە(١٨) . بەڵکو وەکو منداڵی خۆی رەفتاری لەگەڵدا دەکات‌و هەر لەو خۆشەویستییە دایکایەتییەیشەوە هەندێك جار نوقورچیشی لێدەگرێت ، وەکو چۆن دایك زۆر جار لەگەڵ ماچکردندا گازیش لە منداڵەکەی دەگرێت ، کە ئەمەیش شارەزاییەکی تەواوی بارە دەروونییەکەی ئەو ئافرەتە شەعبییەیە . خۆ ئەگەر ئەو رستەیەیش بە ( شزوز ) دادەنێت کە دەڵێت : « .. کە دائەنیشت پشیلەکە ئەچووە سەر رانی مت‌ئەبوو ، ئەویش هێواش .. هێواش دەستی بە پشت‌و کلکە قاوەیی‌یەکەی‌دا ئەهێنا ، پشیلەکە کلکی رەپ‌ئەکرد ، ئینجا هەڵی ئەگێڕایەوەو ئەیخستە سەر پشتی .. » هتد . ئەوا دیسانەوە ئەگەر بە هەڵەدا چوون نەبێت ، بۆ هەڵبەستنە ، چونکە گشت کەسێك پشیلە دەخاتە سەررانی خۆی و دەست بە پشتیدا دەهێنێت ، پشیلەیش کە دەست بە پشتیدا هێنرا هەر کلکی وا لێدەکات . جا ناوبردنی ئەم کارە بە ( شزوز ) لەوە زیاتر نییە کە ( کبت ) زۆر جار وا لە ئادەمیزاد دەکات شتەکان بە جۆرێك لێکبداتەوە کە لەگەڵ خەیاڵە نائاساییەکەی خۆیدا بگونجێت‌و . راستییەکە بە بارێکی‌تردا دەخات . تەنانەت لەزەت وەرگرتنەکەی « باجی ئامە » لەوەی منداڵەکەی پاڵەوانی چیرۆکەکە دەستی دەخستە سەر مەمکە « وەك لفکە شامییەکانی » هەر لە ئارەزووی

دایكایەتییەكەوەیە ، چونكە هیچ منداڵێكی نەبووە مەمكی بمژێت ، خۆ ئەگەر وانەبوایە بە جۆرێكی‌تر بەكاری دەهێنا .

**بەم گفتوگۆیە دەمەوێت راستی‌و ناراستی ئەو قسەیە دەربخەم ، ئەگینا خۆدان لەم بابەتانە هیچ نەنگی‌و ناشیاوییەكی تیا نییەو ، بە دەگمەن لە ئەدیبانی دنیا هەن جۆرێك لەو گیروگرفتە ئادەمیزادانانەیان نەكردووبێت بە بابەتی چەند بەرهەمێكیان ، مەگەر ئەدیبانی وڵاتە دواكەوتووەكان ، كە دەیانەوێت زۆر شت هەر لە ژێر پەردەی ئەستووردا بكرێت‌و كەس نەیخاتە پێش چاوان بۆ چارەكردن ، یان هەر هیچ نەبێت بۆ وەرگرتنی وەكو تاقیكردنەوەیەكی سەلبی .**

ئەگەر ئەدەب هیچ پەیوەندییەكی بە ژیانەوە هەبێت‌و ، بە چاوی « چیخۆف »و زۆربەی گەورە ئەدیبان سەیری بكەین ، كە دەربڕینێكی راستگۆیانەو دڵسۆزانەی ژیان‌بێت ، بێگومان وایش پێویست دەكات هەردوو دیوەكەی ژیان بكرێتەوە ، چاك‌و خراپ ، چاك بۆ پەیڕەوكردن‌و خراپیش بۆ چارەسەركردن ، یان خۆ لێلادان ، بێگومان كۆمەڵگای ئێمەیش لە دنیادا تاك نییەو ، هێشتا نەگەیشتووینەتە ئەو لوتكەی پێشكەوتنەی كە هەموو « سۆپەرمان »و بێ‌كەموكووڕی بین ، بۆیە زۆر ئاساییە ئەو كەموكووڕییانەمان لە ئەدەبەكەشماندا رەنگ‌بداتەوە ، چونكە ئەركی ئەدیب ئەوە نییە « مامۆستا یان شێخ یان پڕوپاگەندەچی » بێت‌و ، هەرگیزیش ئەدیبی دڵسۆزو بەرچاو روون وەكو « نەعامە »ی پێناكرێت ، بۆیە گەورە ئەدیبانی دنیا تا ئێستا زیاتر لە پیشاندانی لایەنە سەلبییەكاندا سەركەوتوون وەك لە لایەنە ئیجابییەكان . چونكە ژیان لە چاو ئەو دنیایەوە كە هونەرمەند دەیەوێت زیاتر سەلبییەو هەرگیز بەو تۆزە ئیجابییانە رازی نابێت . « جۆرج لۆكاچ »ی خاون‌بیرو رەخنەگر ئەم مەسەلەیە دەخاتە چوارچێوەی چینایەتییەوەو ، لە كۆمەڵگای بورجوازیدا حەز لە پاڵەوانی ئیجابی كردن بە بەشێك لە ئایدیۆلۆژیای بورجوازی دادەنێت ، كە دەڵێت : « ئەم مەیلە لە مەیلەكانی ئایدیۆلۆژیای بورجوازی زۆر روونتر لە مەسەلەی پاڵەوانی ئیجابیدا دەردەكەوێت »(١٩) . ئەم مەیلەیش بۆیە لە كۆمەڵگایەكی بورجوازیدا وەهایە چونكە : « دەستنیشانكردنی ئەو ناكۆكیانەی هیچ چارێكیان لە كۆمەڵگای بورجوازیدا بۆ نییە ، گشت داوای پاڵەوانی ئیجابی كردنێك لە كەسە سەركەوتووەكان لە گەروودا دەخنكێنێت »(٢٠) . جا نازانم مەسەلەكە بەلای « حەمە سەعید »ەوە چۆن كەوتووەتەوە ؛ كە ئاوەها بەكارهێنانی پاڵەوانی سەلبی لە بەرهەمەكانماندا تاوانباردەكات ؟!! بە هەر حاڵ . . ئێمەیش لەگەڵ « گۆگۆل »دا دەڵێین : « هیچ غەمێكمان نییە ئەگەر پاڵەوانەكانمان بە دڵی خەڵكی نەبن »(٢١) چونكە ناتوانین بۆ زەوق‌و ئارەزووی هیچ كەسێك بە كاغەزی زەردو سوور بیانڕازێنینەوە ؛ ئەوە وتمان رووكەشەكانیشیانمان پێڕازایەوە ؛ ئەی چی لە ناخیان بكەین ؟! خۆ ناخ لە قالب نادرێت !

● چیرۆكی « كڵاو فووچ » سەرەڕای ئەوەی وەكو گشت چیرۆكێكی خۆڕسكی‌تر ؛ پێش‌وەخت وەكو قاڵبێكی وشك بۆ دەربڕینی فیكرێك ؛ یان دروشمێك دانەنراوە ؛ بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا خاڵی نییە لە كۆمەڵێك مەبەستی كۆمەڵایەتی‌و خۆماڵیتی‌و دەروونی‌و شتی‌تر . ئەم چیرۆكە زیاتر وێنە كێشانی هەندێك لایەنی جوان‌و دوو هەند لایەنی ناهەمواری ئەوسای گەرەكێكی هەژاری شارێكی كوردستانە ؛كە «سلێمانی»یەو؛ بە زمانێكی ساكاری گونجاو لەگەڵ رادەی تێگەیشتنی وەها منداڵێكدا ؛ كە ئەگەر زیاتری لێداوابكرێت لەگەڵ ( منطق )ی چیرۆكەكەدا ناگونجێت ؛ چونكە بەرهەمی ئەدەبی مەنتەقی خۆی دەبێت لە خۆیەوە هەڵبهێنجرێت‌و ؛ ناشێت قالبێكی بەسەردا بسەپێنرێت هیچ پەیوەندییەكی پێوەی نەبێت .

بەڵام شێوەی گێڕانەوەی چیرۆكەكە بە تەوژمی هۆش‌و . بە تایبەتیش بە مەنەلۆجی ناوەوەی راستەوخۆو(٢٢) ؛ بە دوو مۆنتاجی گەورەی زەمانی كە یەكێكیان لەمڕۆوە بۆ رابوردووەو.ئەوی تریشیان بە پێچەوانەوە. لەگەڵ كۆمەڵێك مۆنتاجی لێك‌نزیكدا دارێژراوە . . كەچی « حەمە سەعید » لای وایە « لەسەر شێوەی رپیۆرتاژ نووسراوە » ؛ ئینجا نازانم چاوی بە سەرەتای چیرۆكەكە نەكەوتووە كە دەڵێت : « نازانم چۆن رێم كەوتەوە ئەو پیرە گەڕەكەی خوارووی شار . . » تا دەڵێت : « . . لاشەی نوقم‌بووی بیرەوەرییەكەم؛ وردە وردە كەوتەوە سەر ئاو . . » ئەمەیش گشت‌خوێنەرێكی ئاساییش دەزانێت‌گەڕانەوەیە بۆ دواوەو زیندووكردنەوەی هەندێك «بیرەوەری»یە. بیرەوەریش شتی ناخەو. ناخیش بە رپیۆرتاژكاری

هیچی لێدەرناکەوێتو . رێك بە پێچەوانەی ئەم چیرۆکەوەیە . جا بۆیە دەڵێم رەنگبێت « حەمە سەعید » ڕیپۆرتاژکاری لە شێوەی هونەریی شەپۆلی هۆش جودا نەکاتەوەو . نەزانێت ئەمیان رێبازێکی گەورەی نەدەبەو ، ئەویان کەموکوورییەکەو هیچ پەیوەندییەکی بە ئەدەبەوە نییەو . نەگەڕانەوە بۆ دواوەو ، نە چوونە ناخی پاڵەوانەکەوەو ، نە دەربڕینی هەستو نەستیانی تیا نییە . کە گشت ئەمانەیش هەموو خوێنەرێکی ئاسایی بە ئاسانی لە « کڵاو قووچ » دا هەستی پێدەکات .. جا نازانم « حەمە سەعید » چۆن هەستی پێنەکردووە !؟ خۆ بەکارهێنانی هەندێك شتی واقیعیش وەك « قاوەخانەی سەرچیمەن » هەرگیز چیرۆکەکە ناخاتە چوارچێوەی ڕیپۆرتاژکارییەوە . بەڵکو بە پێچەوانەوە بتەوی و باوەڕێکی زیاتر بۆ چیرۆکەکە دەستەبەردەکات ، بەدەگمەن چیرۆكو رۆمانیش هەیە هیچ ناوو رووداوێکی واقیعی تیا نەبێت*، هیچیشیان بەوە نەبوونە بە ڕیپۆرتاژ .. من وای بۆ دەچم ئەگەر « حەمە سەعید » پێشوەخت بڕیاری لەسەر ئەم چیرۆکە نەدایە ، جا لەبەر هەر هۆیەك بێت ، ئەگەر راستیی شێوەکەیشی نەزانیایە ، هەر هیچ نەبوایە بە واقیعیو کوردەواری لە قەڵەمی دەدا نەك ڕیپۆرتاژکاری ؟! ...

● کۆتایی چیرۆکەکەیش بە هیچ جۆرێك وەها نەکەوتووەتەوە وەکو ئەو دەڵێت ، چونکە بەکارهێنانی ژمارەیەك کە لە واقیعدا نەبێت بە هیچ جۆرێك چیرۆکەکە لە ریالیزمی ناخات ، خۆ کاك « شێرکۆ بێکەس » ڕیپۆرتاژی نەنووسیوە تا گشت شتەکان بەبێ هیچ دەستکارییەك باسبکات ، بە تایبەتی ئەگەر لە شوێنێکدا بۆ زیاتر شتێك خستنە سەر چیرۆکەکە پێویست بکات وەکو لەم چیرۆکەدا وایەو،لە لایەن چیرۆکنووسەوە ئیشارەتێکی زیرەکانەیە بۆ ئەو سەردەمەی پاڵەوانەکە بە فلاش باك بۆی گەڕاوەتەوە . ئیتر نازانم رەمزی چی ؟! و رووداوی گەورەی مێژوویی چی ؟! و بوونو نەبوونی ئەو ژمارەیە لە « مصلحة نقل الركاب »ی سلێمانیدای چی ؟! .. وا دیارە « حەمە سەعید » ئەم خاڵەی لەگەڵ «غەفلەت»دا لە لا تێکەڵبووە ، کە ئاسمانو رێسمانیشیان نێوانە .. ئیتر لەم بۆ چوونە هەڵەیەشەوە کۆمەڵێك ئیحتیمالاتی ناموحتەمەلی ریزکردووە ، کە پێویست بە باسکردن ناکەن چونکە بناغەکەیان هەڵەیە .

پاشان دەڵێت : « کۆتایی هێنانیش بە ژیانی پاڵەوانەکە بەو جۆرە ناماقووڵە .. » ، ئەوەی راستیبێت لە یەکەم خوێندنەوەدا منیش ئەم کۆتاییەم زۆر بەدڵنەبوو ، نەك لەبەر ئەوەی بە « ناماقووڵ »م دەزانی ، بەڵکو لەبەر ئەوەی وامدەزانی لە پڕێکدا هاتووەو ، هیچ رێخۆشکردنێك لە چیرۆکەکەدا بۆ ئەو کۆتاییە نییە ، بەڵام هەر کە تۆزێك لێی وردبوومەوە دڵنیابووم کە ئەوە تەنها کۆتاییەکی شیاوە بۆ « باجی ئامە » ـ نەك پاڵەوانەکە ، چونکە منداڵەکە پاڵەوانە ـ و بۆ چیرۆکەکەیش. بۆ « باجی ئامە » چونکە لە چیرۆکەکەدا رێی بۆ خۆشکراوە کە هەر خۆی دەڵێت ، « ـ شلبوونی چی .. دنیا پێنجو دوو رۆژێکە ، گەنجین با بێدڵی خۆمان نەکەین ». چیرۆکەکەیش خۆ هەر دەبوو کۆتایی بێت،هەواڵی نەمانی « باجی ئامە »یش باشترین لەنگەرە بۆ چیرۆکەکە ، ئەمە جگە لەوەی شتێکی سەیر دەبێت بە نووسەر بڵێین چیرۆکەکەت وا لێمەکەو والێبکە ! چونکە ئەگەر وەها بە فیتەرو دارتاشیش بڵێیت شار بە دەرت دەکات . بۆ بەرهەمی ئەدەبیش پێویستە بەڵگە بۆ نیشانەی گونجاویو نەگونجاوی لایەنێك لە دەقەکە خۆیەوە هەڵبهێنجرێت ، لێرەدا ئەگەر پەنا ببەینە بەر واقیعیش هەر ئەو ئەنجامە زۆر نزیکە لە رووداندوەو ، هەرگیز نەك ناماقووڵ نییە ، بەڵکو زۆر ئاساییە ئافرەتێکی ئەوسا ، کە ئێستا بێگومان پیرێژنێکی پەککەوتەی بێکەسو هەژارە ، بیەوێت لە جادەیەکەوە بپەڕێتەوەو یەکێك لەو ئۆتۆمبیلە بە پەلەو گوێنەدەرانە بیکەن بەژێرەوە.. جا ئەگەر ئەمە ناماقووڵ بێت دەبێت بە هەندێك شتیتر چی بڵێین کە رۆژانە لە ژیانماندا روودەدەن ؟!

● **سەیریش ئەوەیە (( حەمە سەعید )) بە دەنگێك کە تادێت زیاتر هەڵدەچێت دەڵێت : ((تەنیا مەبەست ختووکەدانی عاتیفەی خەلکیە))، لە کاتێکدا کاك (( شێرکۆ بێکەس )) هیچ جۆرە سۆزێکی دەربارەی ئەو سەرئەنجامە دەرنەبڕیوەو، مەسەلەی سۆزەکەی بە تەواوی داوەتە دەستی خوێنەران خۆیان . ئەمە لە کاتێکدا دەربارەی هەندێك لەو چیرۆکانەی لە فلیمە هیندیو میسرییە فرمێسك سوالکەرەکان دەچن هیچ شتێکی وەها نالێتو ، بگرە بە دلیشین ! لەم (( بانێکەو دوو هەوایە ))یش سەیرتر ئەوەیە ئەگەر لە رووی (( ختووکەدانی عاتیفەی جەماوەر )) ەوە**

**بەراوردێکی هەر ئەم نووسینەی « حەمە سەعید » خۆی لەگەڵ ئەو چیرۆکەدا بکەین ..**

● لە هەموو ئەمانەیش سەیرتر ئەوەیە کە دەڵێت : « بە لابردنی دوا پەرەگرافیش نەك هەر کەڵێن ناکەوێتە چیرۆکەکەوە بەڵکو چیرۆکەکە لە کەناری راستەقینەی خۆیدا ئارام دەگری » . نازانم بە چ ئەقڵێك دەشێت ئادەمیزادێك لە ساڵی ١٩٧٨ دا ـ کە ساڵی نووسینی چیرۆکەکەیە ـ لە شوێنێکدا هەندێك رووداوی ساڵی ١٩٤٨ی بیربکەوێتەوەو ، چەند دەقیقەیەك بە خەیاڵو بە هونەری چیرۆك بگەڕێتەوە بۆ سەردەمی منداڵیی خۆیو ، ئیتر هەر بە منداڵی بمێنێتەوەو ، مێژوویش « ٣٠ » ساڵی رەبەق بگەڕێنێتە دواوە ! ئەگەر ناماقووڵ لە دنیادا هەبێت هەر ئەمەیە .

● خاڵێکی تریش لەو سەیرانە ئەوەیە نووسەر دوای ئەوەی چیرۆکەکە بە ریپۆتاژکاری گوناهبار دەکات ، هەر دوای نیو لاپەڕە بەرپەرچی خۆی دەداتەوەو دەڵێت : « .. گێڕانەوەی چیرۆکەکە لە شێوەی نوێدایە .. » ! بەڵام لێرەشدا خۆی ئاسایی نە جۆری نوێیەکە دەردەخاتو ، نەیش دەیسەلمێنێت ئایا ئەم قسەیەی دوایی راستە ، یان ئەوی پێشووی ؟!

* * *

● **لە چیرۆکی « ئەو شەوانەی بۆت ئەگریمو ئەو رۆژانەی لە بیرم ناچێتەوە »ی(٢٣) کاك « عبدالله عباس »دا ، نووسەر لەبەر هەر هۆیەك بێت کرۆك ( ثیمە )ی چیرۆکەکە پشتگوێ دەخاتو دەنووسێت بە هەندێك لایەنی لاوەکییەوە، بۆ ئەوەی ئەو قسانە دووبارە بکاتەوە کە ئەوەندە وتراونەتەوە بێتامبوونە ، بۆیە بە پێویستی نازانم لەسەری رابوەستمو ، تەنها ئەوەندە دەڵێم کە هەرگیز مەرج نییە تێبورەکان بۆ گشت سەردەمو لە گشت شوێنێکدا لەگەڵ واقیعدا بگونجێن .**

● دوایش نازانم « حەمە سەعید » بۆ لە بڕیکدا لە کاك « عبدالله عباس » دەبێت بە « کاسۆلیکی » و باوەڕ بە ژنو مێردایەتیی هەتا هەتایی دەهێنێت ، ئەگەر ئەو پەیوەندییە سەرنەکەوتوویش بێت ؟! ئەوەندەی من بیزانم لە مانڤێستەکەدا بە پێچەوانەوەیە .. لێرەیشدا دەڵێم ئەگەر ئەم چیرۆکە هی کاك « عبدالله عباس » نەبوایەو ، نووسەر هەوەسی هەبوایە دەیتوانی وا لێکیبداتەوە کە هەوڵێکە بۆ گۆڕینی واقیعێکی تاڵو رزگاربوون لە کۆتو پێوەندێك کە پاڵەوانەکە هەوڵی پچڕاندنی دەدات ..

پاشان نووسەر حەماسەتێکی تەواو دەیگرێتو نەبڕەی خوتبەکەی تەواو بەرز دەکاتەوەو دەڵێت : « لێرەدا روودەکەمە ئەوانەی کە وا تێدەگەن راستگۆیی لەوەدایە کە چیرۆکنووس یا شاعیر بەرهەمەکانی ئاوێنەی راستەقینەی هەڵسو کەوتو تەنگو چەڵەمەو ئاواتو خواستی شەخسیی خۆی بن کە ئەمە ئەوپەڕی ( نێرجسییەتە ) . یان لە چاکترین حاڵەتدا تەعبیرێکی فۆتۆگرافییانەیە لە واقیعێکی مەیو » .. پێش ئەوەی راستیی ئەم قسەیە روونبکەینەوە . حەزدەکەم لەسەر وشەی « فۆتۆگرافی » رابوەستین . بۆ ئەوەی بزانین ئەم نووسەرە چەند لە سەرەتاو بناغەکانی نەك چیرۆكو لێکۆڵینەوەو رەخنە . بەڵکو مەعلوومات عامەی ئاسایی دەزانێت ؟ .. وشەی « فۆتۆگرافی » وێنەی ئاسایی سەر کاغەز دەگرێتەوە . کە لە ئەدەبیشدا شتێك بە فۆتۆگرافییانە لە قەڵەم دەدرێت . وا دەگەیەنێت ئەو بەرهەمە وەك وێنەیەکی ئاسایی کە بەکامیرە گیرابێتوایە . واتە نە جووڵەو بزوانو ، نە شیکردنەوەی ناخی پاڵەوانەکانو نە هەستو سۆزیانو نە هیچ شتێکی تری وەهای تیا نییە ، بەڵکو برێتییە لەوەی بە چاو دەیبینێتو بیخەیتە سەر کاغەز.. کەچی ئەم رێك بە پێچەوانەوە ، ئەو وشەیەی بۆ شتە زۆر وردو تایبەتییەکانی ناخی پاڵەوانەکان بەکارهێناوە! بە راستی کامیرایەکی سەر سووڕهێنەرو ، ئیختیراعێکی تەکنۆلۆژیی مەزنە ئەوەی بتوانێت وێنەی « تەنگو چەڵەمەو ئاواتو خواست »و ئەمجۆرە شتانەی ناخ بخاتە سەر کاغەزی وێنەی فۆتۆگرافی ؟!

ئەمە هیچ ، با بێینەوە سەر مەبەستەکە . کە بە توندوتیژییەکەیدا دیارە تاوانبارکردنە ، با وشەکان لە جێی خۆیشیاندا نەبن . من پێش ئەوەی خۆم هیچ بڵێم شاکارە هەرە مەزنەکانی ئەم دنیایە بە نموونە بۆ پووچکردنەوەی ئەو قسەیە دەهێنمەوە . وەکو « پیرەو دەریا »و گشت بەرهەمەکانی « هەمەنگوای »(٢٤) و « یۆلیسیس »ی « جێمس جۆیس »(٢٥)و «گەڕان لە کاتە ونبووەکە »ی « مارسیل برۆست »(٢٦) و زۆر تا کەمی سەرتاپای بەرهەمەکانی « دیستۆیفسکی » و « لیۆ تۆلستۆی » و « شەکسپیر »(٢٧) و زوربەی شاکارە ئەدەبییەکانی

گەورە ئەدیبانی دنیا . کە بە ئاشکرا رەنگدانەوەی ژیانی نووسەرەکانیانی پێوە دیارەو ، ئەوەیش رای گەورە رەخنەگرانو لێکۆلەرەوانی دنیایە ، کەسێك مەبەستی بێت زۆر بە ئاسانی دەگەڕێتەوە سەریان . وەك لە پەراوێزەکاندا دیاریم کردوون . . ئینجا ئەدیبو خوێنەری کورد نازانێت بە کلکی کەلەشێرەکە باوەڕبکات یان بە قسەکەی مەلای مەزبوورە ؟!

هەر کەسەو ئارەزووی خۆیەتی . بەلام من باوەڕناکەم ئەدیبی رەسەن ئەگەر لە تاقیکردنەوەیەکدا قالنەبووبێتو ، بە تەواوی ئاگاداری گشت لایەنێکی ئەو بابەتە نەبێت کە لەسەری دەنووسێتو ، گشت خۆشیو ناخۆشییەکی ئەو بارەی نەچەشتووبێت ، باوەڕ ناکەم بتوانێت بەرهەمێکی راستگۆو پوخت بهێنێتە بەرهەم . دارتاشو بەرگدروو و ئەوانیتر دەتوانن بە پێی کەتەلۆگو پێوانەو کێشانە چیت بوێت بۆتی دروستبکەن ، بەلام ئەدەب هێشتا ئەوەندە بازاڕی نەبووە وەهای لێبێتو ، ئەدیبی راستگۆو دلسۆزیش بەر لە گشت کەسێك بۆ خۆی دەنووسێتو ، داهێنانی ئەدەبیش کارێکی تەواو تاقەکەسییەو(٢٨) ، هەرگیزیش بە خوێندنەوەی چەند سیپارەیەك وەدەستنایەت . بەلام ئەوەیش هەیە پێویستە ئەو تاقیکردنەوەو هەستو ئەستە خودیانە ـ نەك شەخسییانە ـ پێزێکی ئەوتۆیان بدرێتی تا ببن بە شتێکی گشتی ، ئەگەرچی زووربەیشیان هەر خۆیان لە خۆیاندا گشتیشن(٢٩). مەگەر یادگارنامەو نامە تایبەتییەکان نەبێت ؛ کە ئەوانیش زۆر جار لە سنووری تایبەتی دەردەچنو دەبن بە شتێکی بە کەلك بۆ گشت کەسێك ؛ وەکو یادگار نامەکانی « پابلۆ نیرۆدا »و « کازانتزاکی » و نامە تایبەتییەکانی « کافکا » و « سەیاب » و زۆرو زۆریتر . .

لە شیعریشدا داوا لە نووسەر دەکەم با شیعرەکانی « گۆران »ی ئەمری خۆمانو « یەسینین »ی رووسیو هەرکەسێکیتر کە ئەو لەم دنیایەدا هەلیدەبژێرێت بخوێنێتەوە . بۆ ئەوەی بە چاوی خۆی ببینێت ، جوانترینو راستگۆترینو کاریگەرترین پارچە شیعر هەر ئەوانەن کە « ئاوێنەی راستەقینەی هەلوکەوتو تەنگوچەلەمەو ئاواتو خواستی » خودیی شاعیرەکەنو ، ئەو قسە زۆر باوەڕ بە خۆیەی ئەو پووچ دەکەنەوە ؛ کە نازانم لە کوێوەی هێناوەو . . ئەگەر بێئاگایی نەبێت لە ئەدەب لە چیەوە پێی گەیشتووە ؟!

* * *

● « حەمە سەعید » دەربارەی چیرۆکی « چاوەروانی »ی(٣٠) منیش دەلێت : « . . بە ( مەنەلۆژی ) ناڕاستەو خۆ دەستپێدەکات » ، ئاشکرایە کە « مەنەلۆجی ناراستەوخۆ وا لە خوێنەر دەکات بەردەوام هەست بە نووسەر بکات »(٣١) ، واتە پالەوانەکە خۆی نادوێت ، بەلکو نووسەرەکە خوێنەر دەباتە زەینی پالەوانەکەوەو ، هەستو بیرو لێکدانەوەکانی بۆی دەردەخات ، بە پێچەوانەی چیرۆکەکەی منەوە کە لە یەکەم وشەوە تا دوا وشە بە مەنەلۆژی ناوەوەی راستەخۆی تەواو نووسراوە ، واتە نووسەر خۆی پالەوانەو ، لە رێگای ئەویشەوە خوێنەر راستەوخۆ بە چاوی پالەوانەکە دەبینێتو بە مێشکی ئەو بیردەکاتەوەو لە ناوزەینی ئەودایە(٣٢) ، واتە خوێنەر خۆی دەبێت بە پالەوانەکە ، راستەوخۆییەکەیشی لەمەدایە ، سەرەرای چەند وردە بناغەیەکیتری ئەم تەکنیکە کە کاتو شوێنو کەسانی ناوەوەی پێدەگۆڕدرێت(٣٣) . خۆ ئەگەر نووسەر ئەو قسەیەی دەربارەی «کلاو قووچ» یان «رەشەڕاو» بکردایە ، دەوترا لێی تێکچووەو ، تا رادەیەك چاوی لێدەپۆشرا ، بەلام بۆ ئەم چیرۆکە . . هیچ بیانوویەکی بۆ نییە نەشارەزایی نەبێت . . خۆ نایشکرێت منیش وەکو ئەو بلێم « عەرزی عەزەلاتە » ، چونکە هەر گۆشتیشی پێوە نییە !

● پاشان دەلێت : « پالەوانی چیرۆکەکە مرۆڤێکی بێزارو بێئومێدە ، لە جێیەکی دیاریکراودا راوەستاوەو چاوەڕێیە ( قاپی ) ( رەحمەتی ) بۆ بخرێتە سەرپشت . . » . گشت ئەو شتانەی دەربارەی پالەوانی سەلبیو ئیجابیو وازهێنانی نووسەر لە کرۆکی چیرۆکەکەو ، نووسان بە هەندێك لایەنی لاوەکییەوەو ئەو شتانەی تری دەربارەی هەندێك لایەنی « کلاو قووچ » و چیرۆکەکانی کاك « عبدالله عباس » وتم لێرەشدا هەر وانو پێویست بە دووبارەکردنەوە ناکەن . بۆ نموونە « حەمە سەعید » دەلێت : « . . راوەستاوە . . » ، منیش دەلێم تۆ بلێیت چیرۆکەکەی خوێندبێتەوە ؟! ئەگینا چ خوێنەرێك ـ نەك لێکۆلەرەوە ـ هەیە نەزانێت ئەمە « دانیشتن » دەگەیەنێت « ئا ئێرەی وت . ئەو پەنایە باشە ، روبارەکەو دیمەنی خۆرنشین لەو

دیو جامەکەوە . سەر دەنێم بە سەریەوەو .. هتد » ؟ باشە باوکم ئەوە وتمان ئەم رستەیە لەوە ئالۆزترە « حەمە سەعید » بتوانێت لێکیبداتەوە.. خۆ ئەو « مۆتیف » واتە رەسمەی لە ژێر ناونیشانی چیرۆکەکە چاپکراوە ئاشکرایە . بە هەرحاڵ ، ئەمە بابەخێکی ئەوتۆی نییە لەوە زیاتر کە دەردەکەوێت ئەو چەند لەو بەرهەمانە وردبووەتەوە : ئینجا نووسینەکەی نووسیوەو . چەند هەست بە لێپرسینەوە بەرامبەر بەو شتانە دەکات کە وتوویەتی ، عەبەسییەت هەرگیز نەگەیشتووەتە ئەم رادەیەی گوێنەدان ! هەر بۆیەیش هیچ سەیر نییە بۆ ئەو بە ژووانێکی دڵداری بڵێت ( قاپی ) ( رەحمەت ) ، ئەگەر هەر زانیبێتی کرۆکی چیرۆکەکە چاوەڕوانی کردنێکی دڵدارێکە ! چونکە ئەو لەبەر سەرقاڵی بە شتیترەوە ماوەی دڵداری کردنی نەبووەو ؛ بەلایەوە شتێکی ناهەموارە ئادەمیزادێك دڵداری بکات ، یان هەر لە چیرۆکێکدا باسی ژووانێکی دڵداری بکات ، چونکە ئەم کارە خزمەتی لایەنە فیکرییەکەی ناکات !

● **ئینجا نازانم پیاو لە کاتی چاوەڕوانی کردنی دڵدارەکەیدا کە لەسەر ژووانێك لەگەڵیدا رێككەوتووبێت دەبێت چ رۆڵێکی هەبێتیان نەبێت کە ئەو دەڵێت : « .. بەبێ ئەوەی هیچ رۆڵێکی هەبێت » ، بە تایبەتی ئەگەر چیرۆکەکە هەوڵدانێك بێت بۆ دەربڕینی ئەو تاقیکردنەوەیە بە گشت پەژارەو نیگەرانییەکییەوە .. تۆ بڵێت « حەمە سەعید » داوا لەو ئاشقە بەدبەختە بکات بۆ ئەوەی « رۆڵی هەبێت » دەستبداتە چەکێكو بچێت دڵدارەکەی بە زۆر بەکێش بکاتو ، هەر بە زۆری چەك گشت رازو نیازێکی دڵە پەرۆشەکەی بۆ باس بکات ؟!**

● « حەمە سەعید » دەڵێت : « کەسێ باوەڕی بە توانای مرۆڤ هەبێت دەگاتە ئەو قەناعەتەی کە مرۆڤ دەتوانێت هەموو کۆسپەکانی بەردەمی تەخت بکاتو ئەم داوو دەزگایە بڕوخێنێ کە دەیکاتە بورغوویەك لە ئامێرێکدا » بەڵام « جۆرج لۆکاچ » لە هەمان روانگەوە دەڵێت : « خەڵکی هەموو یاریی دەستی هێزە کۆمەڵایەتییە ـ ئابوورییەکانن‌و ، ویستو بگرە نیازە رەوشت بەرزەکانیشیان هیچ کارێکی ئەوتۆ ناکاتە سەر چارەنووسیان »[٣٤] . منیش لەگەڵ « هەمەنگوای » دا دەڵێم : « دەشێت ئادەمیزاد تێك بشکێت ، بەڵام هەرگیز نابەزێت » .

ئەمە وتەی ئەدیبێکە کەم تاقیکردنەوەی جیهانیو تایبەتی هەبووە لە ژیانیدا خۆی تێنەهاویشتوو بێتو ، ئەوی تریشیان وتەی خاوەنبیرێکی پێشکەوتنخوازی بەناوبانگو لێکۆڵەرەوەیەکی سەرکەوتووەو ، ئەوەیش قسەی یەکێکە لەو رەخنەو ! لێکۆڵینەوە ! نووسانەی بوونە بە تووشی ئەدەبەکەمانەوە ، جیاوازیی نێوان سەرنجی یەکلاییو رووکارو ، سەرنجی فیکریی مولتەزیمو ، سەرنجی قووڵو شموولییەتی مرۆڤانەیش لە نێوان ئەم سێ وتەیەدا زۆر ئاشکرایە . ئینجا نازانم پێویست دەکات بڵێم ئەو قسەیەی نووسەر لەو جۆرە قسە زیاد لە پێویست خۆشو باوەڕانەیە کە زیاتر بە لای گێلۆکەیدا دەداتو ، بۆ فریودانی ساویلکەکان دەستدەدات نەك بۆ ئەدیبێك ، یان مرۆڤێك هەردوو دیوەکەی ژیان ببینێت .

● پاشان دەڵێت : « ( فیکری ) چیرۆکەکە لەوەدا کۆ دەبێتەوە کە صلاح پێمان دەڵێت : هەموو رۆژو مانگو ساڵەکان وەك جەوهەر لە یەك دەچن .. » ، باوەڕتان بێت کە ئەمەم خوێندەوە خێرا بە چیرۆکەکەدا چوومەوە ، وتم نەوەکو لە چاپکردندا وەها رستەیەکی نووسینێکی تری تێکەوتووبێت ! بەڵام دوایی بۆم دەرکەوت ئەمەیش یەکێکە لەو بۆ هەڵبەستنانەی کە چەند جارێك لەو نووسینەدا دوو بارە بووەتەوە ، مەبەستەکەیش ئاشکرایە بۆ ئەوەیە ئەوەی لە دوایدا وتوویەتی بیڵێت ، ئەگینا وەك روونمان کردەوە مەبەستی چیرۆکەکە ئاشکرایەو ، وشەی ( فیکر )یش هەرگیز بۆ ئەم چیرۆکە دەستنادات ، وەکو بۆ زۆربەی هەرە زۆری بەرهەمی ئەدەبیو هونەریی ئەم دنیایە دەست نادات[٣٥] ، ئەمەیشمان هەر روونکردەوە .

● دوایی بە هەوایەکیتر لەسەر هەمان ئاواز دەڵێت : « صلاح لەم چیرۆکەیدا تازەترین تەکنیکی بەکارهێناوە ، بەڵام تازەگەریو نوێ کردنەوەو داهێنان ئەوە نییە تەنیا شێوە بگرێتەوە ، بەڵکو بە پلەی یەکەم ناوەڕۆك دەگرێتەوە ، بۆیە تازەگەریو نوێکردنەوە تەعبیرکردنە لە فیکری پێشکەوتووخوازترین هێزی ئەم سەردەمە » . منیش لەگەڵ تێکڕای هونەرمەندانی ئەم دنیایەدا دەڵێم : « تازەگەریو نوێکردنەوە » بە پلەی یەکەمو دووەمو سێیەمیش هەر پەیوەندیی بە تەکنیكو هونەری بەرهەمەوە هەیە[٣٦] ، جا

ناوەرۆك بە لای ئەم یان ئەوەوە چاك بێت یان خراپ . بە پێچەوانەیشەوە هیچ ناوەرۆکێکی بەرز نەك هەر نووسەر ناکات بە تازەگەرو نوێخوازو داهێنەر ، بەڵکو نووسینیش ناکات بە بەرهەمی ئەدەبی یان هونەری ، چونکە دەشێت نووسەرێك بە وتارێك باشترین ناوەرۆك و بەرزترین فیکر دەرببڕێت و نووسینەکەیشی هەرگیز نەك « تازەگەری و نوێکردنەوەو داهێنان » نەبێت، بەڵکو ئەدەبیش نەبێت ، بە پێچەوانەی ئەمەیشەوە دەشێت بەرهەمێك ناوەرۆکێکی زۆر ئاسایی ، یان بێکەڵك ، بگرە تا خراپیشی هەبێت و کەچی بەرهەمەکەی تازەگەری و نوێکردنەوەو داهێنانیش بێت .. نموونەی بابەتی یەکەم گشت مرۆڤ پەروەرە ( ئاتەدیبەکان )ی دنیا دەگرێتەوە ، هەر لە پێغەمبەرانەوە تا بە فەیلەسووف و سیاسی و گشت ئەوانی تر دەگات ، کە بە وتەو بە نووسین خزمەتی مرۆڤایەتییان کردووە ، بەڵام هەرگیز نەبوونە بە ئەدیبیش تا بە تازەگەرو نوێکەرەوەو داهێنەری ئەدەبییان دابنێین .

**بۆ نموونەی « تازەگەری و نوێکردنەوەو داهێنان » بە ناوەرۆکی ئاسایی ، پێش گشت کەسێك « گۆران »ی نەمر دەهێنمەوە ، کە ناوەرۆکی زۆر لە شیعرەکانی جوانیی ئافرەت و سروشتەو ، شیعر لەوەتەی هەیە بەکاریان دەهێنێت ، کەچی « گۆران » ئەوپەڕی داهێنان و نوێکردنەوەو تازەگەریشی تیا بەدیهێناوە ، بگرە « گۆران » زیاتر بە ناوەرۆکە ئاساییەکان نوێیی و داهێنانی وەدەستهێناوە وەك لە شیعرە بە ناوەرۆك بەناوبانگەکانی ..**

« هیگڵ »ی فەیلەسووف لەم بارەیەوە دەڵێت : « کاری هونەری بریتییە لە لایەنە تەکنیکییە رووتەکەی »(٣٧) . ئەگەر وا نەبێت چۆن ناوەرۆکیی بێکەڵکی وەك ئەوەی تابلۆی « ئافرەتانی ئەفینیۆن »ی هونەرمەند « پابلۆ بیکاسۆ » دەبێت بە « شۆڕشێکی رەسەن » لە هونەری نیگارکێشاندا(٣٨) ؟! خۆ « ناوەرۆکەکەی بریتییە لە پیشانگای بەر دەرگای سۆزانی خانەیەك »(٣٩) کە وێنەی چەند ئافرەتێکی رووتی ناشیرینن . تازەگەری و نوێکردنەوەو داهێنان لەم تابلۆیەدا تەنها لە تەکنیکەکەیدایە کە « بیکاسۆ » بۆ یەکەمجار سەرکەوتووانە شێوەی تەکعیبی بەکارهێناوە .

**ئیتر نازانم پێویست بە نموونەی تر دەکات بۆ ئەوەی بیسەلمێنین کە داهێنان بە پلەی یەکەم و ئینجایش نوێکردنەوە لەوەدایە : چۆنی دەڵێت نەك چی دەڵێت ؟!**

لایەکی تری ئەم مەسەلەیەیش ئەوەیە بەرهەمی تر زۆرن بە بێ نوێکردنەوەو تازەگەرییەکی ئەوتۆ جێگای شایستەی خۆیانیان لە دڵی خوێنەران و رەخنەگران و لێکۆڵەرەوانیشدا کردووەتەوە ، بەڵام بە نوێکردنەوە لە قەڵەم نەدراون ، رۆمانی « زۆربای یۆنانی »ی « نیکۆس کازانتزاکی » و « دایك »ی « مەکسیم گۆرکی »و زۆری تریش هەن لەم نموونەیەن .

دیسانەوە دەڵێم : نازانم « حەمە سەعید » ئەو قسەیەی لە کوێوە هێناوە ؟ ئەگەر هی خۆیەتی بە چی دەیسەلمێنێت و ئەو نموونانەی هێنامانەوە چییان لێدەکات ؟! سەرەرای ئەمانەیش نازانم ئەو « فیکری پێشکەوتوو خوازترین هێزی ئەم سەردەمە .. » بە لای ئەوەوە کام قۆڵەیانەو ؟ کامیان تەواو و کامیان مام ناوەندیی و کامیان لە لێواری پێشکەوتنخوازیدایە ؟! دواییش کێ ئەم پلەی پێشکەوتنخوازییانە دەستنیشان دەکات ؟!. بە هەر حاڵ من چاوەڕێی وەڵامی ئەم پرسیارانە ناکەم ، بەڵام دەڵێم هەق و راستی پێویستی بە هەرا هەرا نییەو ، دڵسۆزیش بە کردەوەیە نەك بە سینگ دەرپەڕاندنی سەرکاغەز ..

● لە کۆتایی ئەو برگەیەیشدا نووسەر دێتە سەر ئەوەی دەڵێت : « .. دوا سەرنجم دەربارەی ئەم چیرۆکە ئەوەیە : وەك چۆن هەوڵدەدرێ بۆ خاوێن راگرتنی دەوروبەری مرۆڤ و هەموو خێرخوازێك دژی پیسکردنی دەوروبەری مرۆڤە ، ئەم جۆرە ئەدەبەش دەوری هەیە لە پیسکردنی بیری مرۆڤدا و دژایەتی کردنی ئەرکی سەرشانی هەموو خێرخوازێکە (١٣) » . هەر کەسێك ئەمە بخوێنێتەوەو بە پێی ژمارەی پەراوێزەکە کە « ١٣ »بە سەیری پەراوێزەکان بکات کە نووسراوە « پێشەکیی رۆمانی ـ عندما تفادر الحیتان ، یوری ریتخیو ـ الاقلام ژمارە ٩ی ساڵی ١٩٨٠ » ، هەر کەسێك سەرنجی ئەمە بدات وا دەزانێت لە دوو خاڵەکە « : »ی دوای وشەی « ئەوەیە » وە ئەم وتەیە هی ئەو رۆماننووسەیە .. کەچی وایش نییەو ، هەرگیز ئەو ئەدیبە بەو زمانی « پیس » ـە نەدواوە ...! راستە ئەو باسی « پاراستنی پاکیی سەرچاوەکانی ناوی سازگارو ، جەنگەڵ و دارستانەکان و ، تا باڵندەو ئاژەڵە ـ دەگمەنەکان ـ دەکات » ، بەڵام

ئاشكرایە « یۆری رایتخیو » بناغەی پاراستنی دەوروبەر دەزانێت چییەو چۆن بە پاراستنی هاوسەنگیی سروشت بەدی‌دێت ، نەك بە لەناوبردنی جۆرێك‌و زۆركردنی جۆرێكی‌تر ـ وەك ئەم وای لێكردووە ـ چونكە زانستیی دەوروبەر پاراستن ـ هەر بۆ نموونە دەڵێم ـ دەڵێت : ئەگەر لە ناوچەیەكدا ئاژەڵە گۆشتخۆرەكانت قڕكرد، ئاژەڵە گیاو گوڵ خۆرەكان زۆردەبن‌و ، كار دەكەنە سەر سەوزایی زەوی‌و ، لە دوایىدا ناوچەكە دەرووتێتەوەو ئاژەڵە گیاخۆرەكانیش لەناودەچن. چونكە سروشت بە درێژایی هەزاران ساڵەی تەمەنی جۆرە هاوسەنگییەكی بۆ خۆی دروستكردووەو ، گشت دەستكارییەكی لە لایەن ئادەمیزادەوە دەبێت بە هۆی سەنگەلابوون‌و ، لە دوایشدا هەرەس‌هێنانی‌و قاتو قڕی .. ئەم مەسەلەیە لایەنێكی تریشی هەیە، ئەویش لەوتاندنی هەواو ئاوە بە دووكەڵی كارگەكان‌و بە دەرمانە كیمیاوییەكانی لەناوبردنی مێرووی ژیانبەخش بە كشتوكاڵ‌و تەندروستی ، راوەستان لە رووی ئەم لایەنەیش وا دەگەیەنێت كارگەكان دابخرێن‌و لێگەڕێن كوللەو مێرووی‌تر وەك جاران كشتوكاڵ بخۆن . ئەمەیش دەبێت بە هۆی گێڕانەوەی مێژوو بۆ دواوەو دواكەوتنی پیشەسازی‌و كشتوكاڵ‌و زیاتر برسی‌كردنی كرێكاران‌و جوتیاران .. بە هەر حاڵ ئەم مەسەلەی پاراستنی دەوروبەرە زۆر لەمە زیاتری دەوێت‌و ، منیش داوای لێبوردن لە خوێنەران دەكەم كە هەندێك لە مەسەلەی ئەدەبەكە دوورم خستنەوە ، بەڵام مەبەستم روونكردنەوەی نەزانی‌و بە هەڵەدا بردن‌و چەواشەیی مەعلوماتی نووسەرە .

« یۆری رایتخیو » ئەم مەسەلە سروشتییە زۆر شارەزایانەو بە زمانێكی ناسك‌و « شاعیرانە » دەباتە سەر ئەدەب‌و دەڵێت : « بەڵام ئادەمیزاد ژیانی ناوەوەیشی هەیە، كە ژیانە رووحی‌و فیكری‌و هونەرییەكەیەتی »(٤٠)، واتە جگە لە بەرژەوەندییە ئابووری‌و كۆمەڵایەتی‌و ئەوەكانی‌تر ، ئادەمیزاد ئەو لایەنە ناوەوەییانەیشی هەیەو ، بایەخدانی یەكلایی بە دیوی دەرەوەی ئادەمیزاد ئەو لایەنانە « لە دنیای تازەدا تووشی لەوتان‌و رووتانەوەو شێواندنی ئەنقەست دەكات .. » . بۆ نموونەی ئەمەیش « ئەدەبی توندو تیژی‌و رقەبەرایەتی‌و رەگەزپەرستی » لە وڵاتە رۆژئاواییەكاندا دەهێنێتەوە . ئەم بۆچوونەیش هیچ جیاوازییەكی لەگەڵ مەبەستی بەرهەمەكانی « ئەلبێر كامۆ »و « سەمۆییل بیكیت »و ئەو دوای پێشەرەوەكاندا نییە(٤١) ، كە لێرەدا « حەمە سەعید » دەیەوێت چیرۆكەكەی من بداتە پاڵیان‌و ، لەو رێگایەیشەوە بەوپەڕی « توندو تیژی‌و رقەبەرایەتییەوە » ـ كە « یوری رایتخیو » نەفرەتی لێدەكات ، هەر بە دەمی ئەوەوە ـ ئەدەبی دژ بە شارستانیی رووكەش‌و ئادەمیزاد بە بورغوكەر بە زمانی « پیس » باس‌دەكات .. نازانم تۆ بڵێیت ئەم داوا لەو نووسەرانە بكات لە ناو ئەو زەلكاوو ناهەمواری‌و لەوتاوییەوە ئەدەبێكی پڕ لە گوڵ‌و گوڵزارو شێنەیی بهێننە بەرهەم‌و ، چاو لە ئاستی ئەو ژیانە نامرۆڤایەتییە بچووقێنن‌و،هەر بە خەیاڵ بڵێن : ئۆخەی دنیا چەند خۆش‌و رەنگینە ؟! یان مێروولە هەر پێی خۆشە بچێت بەگژ قوللەی قافدا ؟!

* * *

● « ئەرستۆ »ی فەیلەسووف دوو هەزار ساڵ زیاترە وتوویە : « تا زۆرتر بزانم ، زیاتر بۆم دەردەكەوێت كە كەمتر دەزانم » . « حەمە سەعید »یش دیوەكەی تری ئەم وتەیە دەچەسپێنێت ، كە ئەویش لە خۆ رازی‌بوون‌و خەڵكی بە هیچ نەزانینی نەزانە ، بۆیە وەكو بەرپەرچدانەوەیەكی وتە چرو پڕ بە پێستەكەی كاك « حسێن عارف » دەربارەی چیرۆكی « رەشەراو »ی(٤٢) كاك « سەلام محەمەد » كە وتوویە : « شێوەی مناجات‌و مۆنۆلۆژە ناوخۆكە لە دەربڕینیماناو مەبەستدا یاریدەی زۆر داوە .. »(٤٣) ، ئەم بە نیمچە دڵنیاییەكەوە دەڵێت : « من پێم وایە چیرۆكەكەی سەلام شتێكی تەقلیدی‌یە بەڵام بە شێوەیەكی نوێ نووسیویەتی ، بۆیە نوێ‌ترین تەكنیك ئەو باسە تەقلیدی‌یە ناكاتە كارێكی ئەدەبی‌ی سەركەوتوو » بەر لەوەی لەم قسەیە وردببینەوە ، بابزانین وشەكانی چەند لە جێی خۆیاندان : جارێ نووسەر بە « پێم وایە » قسەدەكات ، واتە زۆر دڵنیانییەو ، هەر بە ڤیروسیا وتوویەتی . لێكۆڵینەوە بناغەو بنچینەی خۆی هەیەو ، ناشێت وەكو مەتەڵ هەڵهێنان بنووسرێت ، بەڵام بە هەر حاڵ لە سەرەتاوە دەزانین نووسینەكە لێكۆڵینەوە نییەو ، با ئەمەیش بچێتە پاڵ ئەوەكانی‌تر . جگە لەمەیش وشەی « تەقلیدی » وەكو وشەی « فۆتۆگرافی » بە جۆرێك بەكارهێنراوە كە هەرگیز وا ناگەیەنێت . خۆ ئەگەر بە « تەقلیدی » مەبەستی بابەتی چیرۆكەكە بێت ، ئەوە بێگومان هەڵەیەو هیچ

بابەتێك نییە « تەقلیدی » بێت ئەگەر دەربڕینەکەی سەرکەوتووبێت. ئەگەر وا نەبێت چی لە دڵداریو

بە جوانی ئافرەتو سروشـتدا شـیعر وبڕو لاواندنەوە تەقلیدیتر هـەیـە . کـە « گۆران »

بەرزترین شیعریشی پێوتوون . ئەمەیش ئەوەندە ئاشکرایە پێویست بە نموونە هێنانەوە ناکـات .

خۆ ئەگەر مەبەستیشی شـێوەی ئەو چیرۆکەیە . ئەوە هەر هەڵەیـە . چونکە « تەقلیـدی » واتـە

لاسایی کردنەوەی ئەو شـێوانەی ئـەوەنـدە بەکارهێنراون گیانیان تیـا نەمـاوە .. ئەمە لـە

چیرۆکدا ئەو شـێوەیە دەگرێتەوە کـە مەرجە باوەکانی چیرۆك پـەیـڕەو دەکـات . وەك سێ

قۆناغەکەی سەرەتاو لوتکەو کۆتایی . سـەرەڕای رووداوو پاڵەوانو کاتو شوێنێکی دیارو ، چەند

وردە تـێکیتر . جا نازانم تۆ بڵێیت چیرۆکی « رەشەڕاو » وەها بێت ؟! .. نەخێر . بگرە هەر

لە شێوە کەم ناسراوەکانی چیرۆکە و . ئەگەر کاك « حسێن عارف » سـەرنجی بۆ « شـێوەی

مناجات »[44] ـ کە لقە تەکنیکێکی زۆر تایبەتیو تەسکی شەپۆلی هۆشە[45] ـ رانەکێشـایە ،

رەنگبوایە نەك هەر بە تەقلیدی دانەنرایە . بەڵکو لەسەر چیرۆکی ئاسایش حساب نەکرایـە ..

ئەگەرچیش « د. شۆ » رای وایە هەر نووسینێك شیعر نەبێت چیرۆکە .

● « حەمە سـەعید » کـە دەڵێت :

« بە شێوەیەکی نوێ نووسـبویەتی » . لەگەڵ ئەوەیشدا ئەم قسەیە زۆر گشـتییەو . کەم

بەرهەمی ئەمرۆ ناگرێتەوەو ؛ لەگەڵ ئەوەیشـدا خۆی واتەنی « ماڵی بێدانە » ، بەڵام بۆ ئەگبەتی

ئەم چیرۆکە ناگرێتەوە ! چونکە شـێوەی « مناجات » رەگێکە لەو رەگانەی تەوژمی هۆش

لەسەری رواوە . تەنانەت شـاعیری مەزنمان « ئەحمەدی خانی »ش نۆ سەد ساڵ بەر لە ئێستا

لە کۆتایی « مەمو زین » ـەکەیدا بەکاریهێناوەو ، هەر بە هەمان زمانی کەسی دووەم ـ واتە صیغەی مخاطبە ـ وەك چۆن کاك « سـەلام محەمەد »

لەگەڵ خۆیدا دەدوێت ، « خـانی »ش ئاوەهـا لەگەڵ قەڵەمەکەیدا ـ کە هـەر خۆیەتی ـ دواوە وتوویـە :

**ئەی راکیبی واقیعی پیادە**
**وەی عاشقی صەفحەی دەسادە .. هتد**

● ئەم شێوەیە زیاتر ناخو نیگەرانییەکانی پاڵەوان ـ نووسەری پێدەردەبڕدرێتو ، « ولیەم

فۆکنەر » ر ا‌ی رۆمـانی « لەو کاتەدا کـە بەگیانەڵایی رادە‌کشێم »ی بەم شێوەیە داڕشتووە ، « فەرجینیا وۆلف »یش رۆمانی « شەپۆلەکان »ی هەر بەم شێوەیە نووسیوە . کاك « سـەلام محەمەد »یش توانیویەتی بەم شـێوە هونەرییە

سـەودایی شـاعیرێکمان بۆ دەرببڕێت کە بە درێژایی رۆژێك لە پلەیەکی شاعیرانەی هەستو نەسـتدا دەژێتو . لـە بیرکردنەوە زیاتر هیچ

کارێکیتری نییەو . دیارە قوتابییەکی رۆشنبیرەو یەکەم رۆژی پشوودان گەڕاوەتەوە بۆ دێیەکـەی خۆیان .. ئەم پاڵەوانە لەو رۆژەدا وا هەبـت

دەکات زۆر لە « فۆتیس »ی پاڵەوانی « مەسـیح سـەر لـە نوێ لـە چوار مێخە دەدرێتەوە »ی

« نیکۆس کازانتزاکی »بـەوە نزیکەو ، هـەندێك ناوی تریشی بە مێشـــکدا دێت کـــە ئەوانیش

هەریەکەو لـە لایەکەوە لـەم پاڵەوانەوە نزیکن ، بەمەیش نووسەر تیشکێکی زۆری بەو چەند نـاوە خستووەتە سـەر ناخی پاڵەوانەکەی . ئیتر نازانم « عەرزی عـەزەلات »و کێشـەی نێوان هەژاران و چەوسێنەران و ، ئەم بابەتە قســـانەی « حەمە

سـەعید » دەربارەی ئەم چیرۆکە نووسیویەتی چی پەیوەندییەکی بە کرۆك و مەبەستی ئەم چیرۆکەوە هەیە !؟ ئەمەیە پێی دەوترێت : « گوڵ بـە پەیین لێکدەداتەوە »[٤٦] . ئەو رستەیەی ئەو دەستەو

یەخەی بووەو بە ئامان و زەمان لێی نابێتەوە ، تەنها ئیشارەتێکە بۆ نەریتێکی کوردەواری و ، دیـــارە ئـەو گۆشت و برنجە بـــە بۆنەی گەڕانـــەوەی پاڵەوانەکەوە لێنراوەو ، ئاشکرایە حاڵی ئەمانیش

لە حاڵی ماڵی « پووره مەینج » هیچ باشتر نییە ، ئەگینا بەلای ماڵێکەوە ئەوە خواردنی ئاســـاییان بێت هەرگیز ئەوەندە بە بایەخەوە سەیر ناکرێت تا ناوی ببرێت و دراوســـێی پێ بیربکەوێتەوەو بەشیانی لێبدرێت .

**جا لەبەر ئەوەی نەك ئەم چیرۆکە ، بەڵـکو هەرچی ئەدەب و هونەری دنیا هەیە تاقە منداڵێکی لە برســـێتی پێ رزگار ناکرێت[٤٧] .. بۆیە بـە پێویستی نازانم لەمە زیاتر لەسەری بڕۆم .**

* * *

● « حەمـە ســـــەعید » دەربـــارەی چیرۆکەکەی کاك « محـــن ئاواره » دەڵێت : «من هەرچەندە لەگەڵ ئەوانەدا رێك ناکەوم کـــە لـــە هەڵســەنگاندنی هەموو کۆمەڵە چیرۆکێکدا یەکـە یەکـە چیرۆکـەکان کورت دەکەنەوەو .. هتد » ،

جارێ ئـەو کارە لـــە رەخنـــەو لێکۆڵینـــەوەدا کورتکردنەوەی پێناوترێت ، بەڵکو گێڕانـەوەی حیکایەتی چیرۆکەکەیە بە کورتی ، لـەگـــــەڵ شـــیکردنەوەو روونکردنەوەی هـەندێك لایـەنی

ســـــەرەکی لـە چیرۆکەکەدا بۆ دەرخســــتنی کرۆکـەکـەی . کورتکردنـەوە تەنهـا بۆ رۆمانە درێژەکان دەبێت ، کـــە ئەویش زیـــاتر کارێکی

بازرگانییە ، بەڵام کورتە چیرۆك خۆی کورتە ئیتر چـۆن کـورت دەکرێتـــەوە[٤٨] !؟ جگە لەمەیش وەنەبێت ئەمە بە کارێکی شێواندنی بەرهەمـەکـە دابنێت ، بەڵـکو بـــە کارێکی ئاســــان و « ماڵی بێ دانـە »ی لـە قەڵەم دەدات ، کـەچی گـەورە رەخنەگران بە خۆیاندا راناپەڕن ئـەم کارەبکەن ، چونکە دەزانن بەرهەمەکە ئەوەیە کە بەو شێوەیە دەربـــڕاوەو ، هیـــچ دارشـــــــتنەوەو

گێڕانەوەیەکی چیرۆکەکە نـابێت بـەو بەرهـەمە خـۆی ، چونکە چیرۆك حیکایەت نییـە تـا هـەر کەســـێك بە ئارەزووی خۆی بیگێڕێتەوە . ئەم سـەرنجەیش بۆیە بە پێچەوانەی رای گشـــت گەورە رەخنەگرانەوە چونکە لە یەکێکەوەیە شـتە

هـــەرە باوو گشـــتییەکانی رەخنەیشی پەیڕەو نەکردووە .. دیارە بێگومان دیاردەیەکی نوێیە لە رەخنـــەو لێکۆڵینەوەدا تـا ئەو رادەیەی هیـچ پەیوەندییەکی پێیانەوە نەماوە ! وەکو روونیشمان

کردەوە نووسـەر بە درێژایی نووسینەکەی یەك خاڵی نەگرتووە « مـــاڵی بێ دان » نـەبێت و کەچی لـــە هیچیشیاندا بۆی نەهاتووە ، بەڵام کە هەندێك لەو چیرۆکانە باس ناکات یان لەبەر ئەوەیـە ئەوەنـدە

لێیان وردنەبووەتەوە تا بزانێت چی دەڵێن ، وەك لە « کڵاو تووچ » و « چاوەڕوانی »و « رەشـــە ڕاو »دا دەرکەوت وەهایە ، ئەمەیش چونکە ئـەو پێشوەخت بڕیاری خـــۆی داوە چی دەربارەیان بنووسێت و ، ئیتر هەتی بە ســـەر راســـتی و

ناراستییەوە نەبووە .. یانیش ـ ئەگەر زۆر نیاز پاك بین ـ دەبێت بڵێین نەیتوانیوە لێیان تێبگات ، لەم حاڵەتەیشدا نەدەبوو لەسەریانی بنووسیبایە.

خۆ ئەگەر ئـەم دوو ئیحتمالەیش نەبێت ، ئـەوە خراپتـر ، چونکە دیـارە دەزانێت چیرۆکـەکان چییان دەربڕیوەو ، گێڕانەوەیـــان چـەنـــدیش بشێوێنرێت هەر سـەرنجێکی وەها بـە خوێنـەر

دەدات کە راستیو ناراستیی قسەکانی ئەویان بۆ دەربکەوێت !

* * *

● (( حەمە سەعید )) کە دەڵێت :
(( .. مەبەستی نووسینەکە لە چوارچێوەی راژەی ئەدەبی رەسەنی کوردی نەچۆتە دەرەوەو هێرش بردنی نارەوای بۆ سەر هیچ شاعیرێ نەکردۆتە

درونتم )) ، خۆی زۆر چاك زانیویەتی کە ئەو پاکانەیە زۆر پێویستەو ، گشت کەسێك تێدەگات مەبەستی ئەو نووسینەی ئەو رێك بەو شتانە گوناهبار دەکرێت کە دەیەوێت هەروا بەو قسەیە

لە خۆی بتەکێنێت ، ئەگینا چ پێویستی بە وتنی ئەوە دەکرد ؟! چونکە ئەگەر وەها نەبوایە ئەو هەموو ناوەژووکردنەو بۆ هەڵبەستنەی بۆچی بوو ؟! ئەمە جگە لەوەی ئەگەر ئەو چیرۆکانەی منو

کاك (( شێرکۆ بێکەس )) و کاك (( سەلام محەممەد )) وەهابوون ، خۆ هەر یەکەو چەند چیرۆکێکی‌تری بلاوکراوەمان هەیە .. بەڵام دڵنیام ئەوانیشی بە دەردی چیرۆکەکانی کاك (( عبدالله عباس )) هەر

بە یەك گوناه تاوانبار دەکرد ، کە وا بوو مەسەلە خاوەنی چیرۆکەکانەو ، هەڵێکی ساکارە بۆ ناو زڕاندنیان ، کە وەکو دەرێش‌کەوت بەسەر خۆیدا کەوتەوە . چونکە ئەم دیکتاتۆرییەتەی هەر وا بە

ئارەزوو ئەم پاداشت دەکاتو ئەوی‌تر لەناو دەبات ، ئەگەر لە گشت کوڕێکیشدا جێگای ببێتەوە ، لە کۆماری ئەدەبدا جێگای نابێتەوە .

سەرچاوەو پەراوێزەکان :

١ ـ بۆ نموونە لەم رووەوە بڕوانە : گۆڤاری « الثقافة الاجنبية » ژمارە « ٢ » ١٩٨١ ، « رايان في باسترناك » . ل «٦٦» .

ـ « مایکۆفسکی » کە شاعیرێکی « مستقبلی » بوو لە تەمەنی « ٣٧ » ساڵیدا خۆی کوشت ، بەر لەوە وتوویە : « پاپۆڕی خۆشەویستی خۆی لەسەر تاشە بەردەکانی ژیانی رۆژانەدا تێك‌شکاند » .

ـ خاتو « تسڤیتا بیڤا » پاش ماوەیەکی دوورو درێژ لە دوورخستنەوە گەڕایەوە ، لە ئەنجامی تووشبوونی کۆمەڵێك کارەساتەوە لە سەرەتای جەنگدا خۆی‌کوشت .

ـ « پاشفیلی » شاعیرێکی جیۆرجییە ، لە « ٤٢ » ساڵیدا خۆی‌کوشت .

ـ « فادیێف » پەسەندترین شاعیربوو بە لای « ستالین » و « جدانۆف »ەوە، پاش ئەوەی لەلایەن هاوڕێ نووسەرەکانییەوە لە سەردەمی « توانەوە »دا تووشی رەخنەی توندوتیژبوو ، لە ١٩٥٦ دا خۆی کوشت .

ـ « مۆریس باسترناك » شاعیرو رۆماننووسە ، دوای بلاوکردنەوەی رۆمانی « د. ژیڤاگۆ » ـ کە پاداشتی « نۆبل »ی وەرگرت ـ ویسترا دووربخرێتەوە ، دوای مردنی مۆری لەعنەتی لەسەر هەڵگیردرا .

ـ « یەسینین » لە کۆمەڵە شیعری « قصائد مختارە »ی وەرگێرانی « حسب الشيخ جعفر »دا دەڵێت : « من وەك شاعیرێکی رۆمانتیکی ناتوانم بە کاروانی شیعری شۆڕشگێڕیدا بکەم » ل «٢٣» ، چونکە « کەشتییەکە حاڵی ئێجگار

بەربادە » . پاشانیش خۆی کوشتووە.

٢ - گۆڤاری « الاقلام » ژمارە «٩» ، حوزەیرانی ١٩٨٠ ، ل «٧٣» .

٣ - سەرچاوەی پێشوو .

٤ - « دراســـات في الواقعيــة الاوروبية » ، « جۆرج لـوكـاتش » وەرگێـرانی « اميــر اسكندر » ، بەشی یەکەم ، ل « ٤٣ - ٦٩ » .

٥ - « بەسینین ، قصــائد مختارە » وەرگێرانی « حسب الشيخ جعفر » ، ل «١٢٣» .

٦ - گۆڤاری « بەیان » ، ژمارە «٦٩» ، شوباتی ١٩٨١ ، ل «٣٧» .

٧ - سەرچاوەی پێشوو . لێرە بە دواوە پەنجە بۆ ئەم ســـــەرچاوەیە درێژناکەین چونکە ئاشکرایە .

٨ - گۆڤاری « رۆشنبیری نوێ » ، ژمارە «٤٥» تشرینی دووەمی ١٩٧٥ ، بەشە عەرەبیەکەی ل « ١١ » ، « انطباعات ســريعة عن قصص العدد الماضي » .

٩ - گۆڤاری « نووسەری کورد » ژمارە « ٥ » ، خولی دووەم ، تشــرینی دووەمی ١٩٨٠ ، « شیعر لە نێوان لەزرەت و هەڵوێســتا » ، « حەمە سەعید حەسەن » ل «١٣٢» .

١٠ - کۆمەڵە چیرۆکی « کوێرەوەری » ، «بلە»، ل «٧٥» .

١١- گۆڤــاری « بــەیــان » ژمــارە «٤٢» ، «، چیرۆکەکانی ژمــارەی پێشـــــــووم خوێندەوە » « حسين عارف » ، ل «٤٢» .

١٢ - کۆمەڵە چیرۆکی « کوێرەوەری »، ل«٤٧»

١٣ - بروانە پەراوێزی ژمارە « ٨ » .

١٤ - بروانە پەراوێزی ژمارە « ١١ » .

١٥ - کۆمەڵە چیرۆکی « بە پەنجەکانم دەتبینم » « دلشاد محەمەد ئەمین » ، ل « ٥٣ » .

١٦ بروانە پەراوێزی ژمارە « ٨ » .

١٧ - گۆڤاری « رۆشنبیری نوێ » ژمارە «٧١» تشرینی دووەم و کانوونی یەکەمی ١٩٧٨ ، ل «١١» .

١٨ - کۆمــەڵــە چیرۆکی « زليخە .. البعد يقترب » ، « جليل القيسي » ، ل «٤٥» .

١٩ - « الرواية كملحمة بورجوازيه » ، « جورج لوكاش » وەرگێرانی « جۆرج طرابيشي » ، ل « ١٣ » .

٢٠ - سەرچاوەی پێشوو ، ل «٧٢» .

٢١ - سەرچاوەی پێشوو ، ل «٧٣» .

٢٢ - « تيــار الوعي في الروايــة الحديثة » ، « رۆبەرت هەمفری » ، وەرگێرانی «دكتور محمود الربيعي » ، ل «٤٤» .

٢٣ - گۆڤاری « بەیان » ژمارە « ٤٤ »ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٧ ، ل «٥٨» .

٢٤ - گۆڤاری « الاداب الاجنبيــة » ژمــارەی چوارەم، ساڵی پێنجەم، نیسانی١٩٧٩ « هل كان همنغواى بطل رواياته ؟! » ، ل«٤٦»،

« فيليپ یۆنگ » دەربارەی « پیرەو دەریا» لە ل «٥٩»دا دەڵێت : « دەشــێت ئــەو رۆمـــانــە وەکـــو چیرۆکێکی رەمزیش

بخوێنرێتەوە ، کــە ســـــەرتاپا وێنەی شــەخسییەتی نووســــەرەکەیەتی .. » .

تـایانی باسیشـه کاك « زادوق ئادەم » ئەم

لێکۆڵینەوەیەی کردووە بە کوردی و لـە « هاوکاری »ی ژمارە «٥٨٦»و «٥٨٧»دا بڵاوی کردووەتەوە .

٢٥ – « موسوعة جیمس جۆیس » ، « د. طـه محمود طـه » لـه ل «٣٧٣»دا دەڵێت : « باوکەکە لێرەدا رەمزی ئەو هونەرمەندەیە

( شەکسپیر یان جۆیس ) کە خۆی دەخاتە ناو کارە هونەرییەکانییەوە .. » .

٢٦ – « مارسیل برۆست والتخلص من الزمن » وەرگێڕانی « نجیب المانـع » ، خاتو « جێرمین پرێ » لە ل « ١٨ » دا دەڵێت :

« رۆمانی ( گەڕان لە کاتە ونبووەکـە ) زۆر توندوتۆڵ بە ژیانی نووسەرەکەیەوە بەستراوەتەوە تا رادەیەك گشت ئەو

ڕووداوانەی باسی دەکات لـەو ڕووداوە واقیعییانەوە هاتوون کـە لـە ژیانی ( بروست ) خۆیدا ڕوویانداوە » .

٢٧ – بڕوانە پەراوێزی ژمارە « ٢٥ » .

٢٨ – « نحو روایة جدیدة » . « ئالان رۆب – گرێ » وەرگێڕانی « مصطفى ابراهیم مصطفى » . نووسەر لە ل « ٢٦ » دا

دەڵێت: « مەوزووعییەت بە واتا باوەکەی، واتـە ناخودییەکی بڕای بڕ لـە

سەرنجداندا . شتێکی خەیالییە » .

٢٩ – « جمالیات المکان » . « جاستون باشلار » وەرگێڕانی « غالب هلسا ». « هۆسرل »ی

فەیلەسووف لە ل « ١١ »ی ئـەوکتێبەدا دەڵێت . « مەوزووع نییە بە بێ خود » .

٣٠ – گۆڤاری « رۆشـنبیری نوێ » ، ژمارە « ٦٤ »ی ١٩٧٨ ، ل « ٢٥ » .

٣١ – « تیـار الوعي في الروایـة الحـدیثـة » ل « ٤٩ » .

٣٢ – سەرچاوەی پێشوو ، ل «٤٦»و «٤٩» .

٣٣ – بۆ زیاتر زانین بڕوانە سەرچاوەی پێشوو، بەشی دووەم « جۆرەکانی تەکنیك » ل « ٤٢ – ٨٥ » .

٣٤ – « الروایة کملحمة بورجوازیه » ، ل«٦٠».

٣٥ – « اشکال الروایة الحدیثة » ، « فردریك . ج. هۆفمان » لە « آلدوس هیکلی

وروایە الافکار » ل « ٢٥٢ »ی ئەو کتێبەدا دەڵێت : « عەیبی سەرەکیی لە رۆمانی فیکردا لەوەدایە کە پێویستە لەسەرت

دەربارەی خەڵکێك بنووسیت بیروباوەڕی ئەوتۆیان هەبێت دەری‌ببڕن . ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێت گشت خەڵکی

لابدەیت و تەنها یەك کەس لە هەزاردا لـە خێزانی مرۆڤایەتی بگرێت » . لـە ل « ٢٦٣ » یشـدا دەڵێت : « کاتێك

وتارنووس هەوڵدەدات گیانێك بکات بـە

بەر بیروڕاکانیدا ، رۆمانی فیکر سەر هەڵدەدات » .

٣٦ – « کاکە مەم بۆتانی » دە ساڵ بەر لە ئێستا ئەمەی لـە گفتوگۆیەکدا لـە رۆژنامەی

« هاوکاری »دا وتووە ، بەڵام داخەکەم

ئەو ژمارەیەم لەبەر دەستدا نەبوو تا ژمارەو مێژووەکەی دابنێم .

٣٧ – « المدخل الى علم الجمال » ، وەرگێرانی « جورج طرابیشی » ، ل «٦٤» .

٣٨ – « واقعیة بلا ضفاف » ، «روجیه غارودی» وەرگێرانی « حلیم طوسون » ل « ١٠٥ – ١٣٥ » .

٣٩ – سەرچاوەی پێشوو ، ل « ٣٥ » .

٤٠ – گۆڤاری « الاقلام » ژمارە « ٩ »ی سالی ١٩٨٠ ، پێشەکیی رۆمانی « عندما تغادر الحیتان » ، ل « ١١٢ » .

٤١ – بۆ نموونە بڕوانە شانۆگەریی « سوء تفاهم » و « چاوەڕوانیکردنی گۆدۆ » .

٤٢ – گۆڤاری « بەیان » ژمارە « ٤٠ – ٤١ » ئازاری ١٩٧٧ ، ل « ٦٦ » .

٤٣ – بڕوانە پەراوێزی ژمارە « ١١ » .

٤٤ – « تیار الوعي في الروایة الحدیثة » ، « رۆبەرت همفری » لە ل « ٥٨ »دا

دەڵێت : « مناجاة النفس » یان رازونیاز لەگەڵ خودا – ئەگەر بشێت وەهای

ناوبنێین – « تێکەڵکردنێکی سەرکەوتووانەیە لە شەپۆلی هۆشرو ، لە

کرداری دەرەوە » . لە ل « ٥٦ »یشدا دەڵێت : « ئەم تەکنیکە ناوەوەی زەینو ،

کارە زەینییەکانی پاڵەوانەکە راستەوخۆ

لە پاڵەوانەوە بۆ خوێنەران دەردەبڕێت ،

بەڵام بە جۆرێك کە وەها دانرابێت

جمهورێکی بێدەنگ هەیە »، « مەبەستیشی

گەیاندنی هەستو نەستو بیرە

پەیوەندەکانە بە دارشتنە هونەرییەکەو

کردارە هونەرییەکەوە » .

٤٥ – « چوار جۆرە تەکنیکی سەرەکی هەیە لە

شەپۆلی هۆشدا بەکاردەهێنرێن ئەوانەیش:

مەنەلۆجی ناوەوەی راستەوخۆ ،

مەنەلۆجی ناوەوەی ناراستەوخۆ ، وەسف

لە رێگای مەعلوماتێکی ئێجگار زۆرەوەو ،

رازونیاز لەگەڵ خودا » .. سەرچاوەی

پێشوو ، ل « ٤٢ » .

٤٦ – « جمالیات المکان » ، « جاستون باشلار » ل « ٣١ » .

٤٧ – « قضایا الروایة الحدیثة » ، « جان ریکاردۆ » وەرگێرانی « صباح الجهم » ، ل « ١٨ و ١٩ » .

٤٨ – « عشر روایات خالدة » . « سۆمەرست موم » . پێشەکییەکەی . ل « ١٣ » .



نووسینی : عبدالله ابراهیم
وەرگێڕانی : فاتح عبدالکریم

# جیهانەکانی «جۆیس»

**لە ئەدەبی ڕۆمانکاریی سەدەی بیستەمدا زیرەکیو بەهرەی ( جیمس جۆیس ) لە هەموو زیرەکیو بەهرەکانیتر گرنگترە .... هۆی ئەمەش ، وەك ( مانیۆ هۆدگارت )ی دانەری کتێبی ( جیمس جۆیس ) دەڵێت : دەگەڕێتەوە بۆ وردبینیو قووڵ داچوونی ( جیمس ) لە جیهانە بچووکەکەی کە ( ئیرلەندەیە )و ، لە جیهانە گەورەکەی کە ئەورووپایە ، چونکە زوربەی ژیانی بەگەڕانو هاتوچۆی نێوان پاریسو تریستو ، زیۆریخو ، ڕۆمادا بەسەر بردوە ، بێگومان ئەم بۆچوونەی ( هۆدگارت ) بەشێکی هەڕەمەییو ناوردایەتی تێدایە ، چونکە لە بەشێکی تری کتێبەکەیدا دەیبینین کە خەریکی لێکۆڵینەوەی ڕاراییەکەی (جۆیس)ەو،باسی کاری ڕاستەوخۆی ئەم ڕاراییە دەکات لە ئەدەبەکەیدا ..**

**بەڵێ ناکۆکییەکی زۆر لە نێوان ئەم دوو لایەنەدا نەدەبوو ئەگەر ( هۆدگارت ) بیتوانیایە لەلایەکەوە بڕیاردانە پێشوەکەی کەمێك سووكتر بکردایەو ، لەلایەکی ترەوە درێژەی بەوە بدایە کە ئەورووپا ، لە بارەی غەیری ئەدەبەوە ، چ کارێکی تری کردۆتە جۆیس .**

جا ئەگەر چی ئەم کتێبەی ( هۆدگارت ) چەند بەشێکی گەورەی تێدایە دەربارەی لێکۆڵینەوە لە ڕۆمانەکانی جۆیسو هەوڵی کردنەوەی نهێنییەکانی . ئێمە لەم خوێندنەوەدا تەنها باسی ئەوەندەی دەکەین کە دەربارەی ( جۆیس )ی مرۆڤ نووسیویەتی . چونکە ئێمە لامان وایە کە ڕۆمانەکانی جیمی نووسینو لێکدانەوەو لێکۆڵینەوەیەکی زۆریان بەرکەوتوە لە چاو ئەوەی کە دەربارەی خودی خۆی نووسراوە . ئەگەرچی زۆر شت هەن کە تا ئێستەش نەکەوتوونەتە بەر ڕەخنەو ڕەخنەکاری .

ئەو دوو بەشەی کە لەم کتێبەدانو زۆر لامان گرنگن بریتین لە بەشی یەکەم بەناونیشانی ( جویس - جیهانی گەورە ) لەگەڵ بەشی چوارەم " جیهانی جۆیس " .

دانەر لە بەشی یەکەمدا ڕاپێشوەکەی دەخاتە روو . بەڵام پاش ئەوەی کە بەشێوەیەکی کورت باسی کاری ئێرلەندە لە ( جۆیس )دا دەکات . دەڕواتە سەرباسی کاری ڕۆشنبیریی ئەورووبا لە ( جۆیس ) دا . پاشان جارێکیترو لە بەشێکی تایبەتیدا بەناونیشانی ( جویسو ئیرلەندە ) دەگەڕێتەوە سەر درێژە پێدانی ئەو ڕایەی کە لەسەرەتای بەشی یەکەمدا بەکورتی باسیکرد ...

داخۆ ئێرلەندە چ کارێکی لە جویسدا کردبێت . ئەو کارکردنە لە کوێدا دەنگ دەداتەوە؟ بۆ ئەوەندە گوێی داوەتە تایبەتیەتی ئێرلەندە ؟ بۆچی بۆ هەرکوێ چووبێو لە هەرلایەك دەرچووبێ ئێرلەندەی لەگەڵدا بوە ؟!

جویس له (۲) ی شوباتی (دەبلن)ی پایتەختی ئێرلەندە لەدایك بوە . کە بەشێك بوە لە ئیمپەراتوریەتی بەریتانیای گەورە !

جویسی ساوا هێشتا بچوك بوو کە بە دووچاوی خۆی نیشانەکانی داگیرکاری ئینگلیزی لەسەر خاکی ئەم دورگە ئارامە دەبینیو ، لە پاشاندا ئەو زۆرنبازییە ئایینییە تیژەی دەدی کە لە ناو تایەفە مەسیحیە ناکۆکەکاندا هەبور . . لە سەر خواستی خێزانەکەی لەتەمەنی شەش سالیدا چوە قوتابخانەکانی ( جزویت )ەوەو ، لەو قوتابخانانەدا ، لەم قوتابخانە بۆ ئەو قوتابخانە ، ئامۆژگارییە ئایینییە سەختەکانی وردەگرت ، تا گەیشتە تەمەنی ١٦ سالی . ئەم قوتابخانانە لەبەر هۆ ئایینیو نەتەوەیییەکان تایبەتیەتیی ئێرلەندەو پێویستیی سەربەخۆییان دووپات دەکردەوە .

ئەم قۆناغە لەگیانی جویسدا کارێکی گەورەی کردو بەری ناکۆکییەکان لە قوولایی دەروونیدا پێ گەیشتو . بەشێوەیەکی زۆر جوان لە ریوایەی یەکەمیدا دەریخست بە ناوی « وێنەی هونەرمەند لە لاوێتیدا »و لەچەند کارێکی تری هونەریی لەوە بە دوای . .

**لە لایەکیترەوە هەستی ئێرلەندایەتی هەموو گیانی داگیرکردبوو ، بۆیە لە ئەدەبەکەیدا ، چ بەشێوەی پێچو پەنادارو ، چ بەشێوەی راستەوخۆ گاڵتەی دەکرد بەتاجی ئیمپەراتۆری کە نوێنەری بەریتانیایە ، گاڵتەی دەکرد بە فەرمانڕەوای گشتیی ئێرلەندە کە لە بەریتانیاوە دیاریکرابوو، گاڵتەیەکی قووڵی دەکرد بەنوێنەرانی حکوومەتو، لەم بابەتەوە چەندەها لاپەڕەی جوانی ئەفسووناوی نووسی ، کە بەتایبەتی لە ریوایەتی ( یولیسیر )یدا بەرچاو دەکەوێت ، لە بەشی پانزەهەمیدا بە ناوی ( سرسە )و بەشی دەهەمی بە ناوی ( تاشەبەردە گومڕاکان ) .**

جویس تەنها بەگاڵتە کردن بە داگیرکەرانیەوە نەوەستا ، بەڵکو خەریکی نووسینی نەریتە کۆمەڵایەتیەکانو ئەفسانەو سەرگوزەشتە خۆماڵییەکانو باسی رابەرە سیاسییە ئێرلەندییەکانی دەنووسی ، لە سەرووی هەموویانەوە ( بازنیل ) لە پاشان وێنەی خانوە کۆنە ئێرلەندییەکانی دەکێشا کە لە سەدەی هەژدەهەمەوە درووس کرابوون .

**لە رۆمانە دواییەکەیدا ، کە ناوی « لەخەو هەستانی فینیجان »ە ، زۆر باسی رووباری « لیفی » کردوە کە شاری « دەبلن » دەکاتە دووبەشو ، بە شتەیەکی زۆر باڵا تەقدیسی دەکات ، بە رادەیە ـ ئەو باسە بوەتە ئاوێنەو ئەم شارەی تێدا دەبینرێت ... هەروەها مێژووی ئێرلەندەی خوێندوەتەوەو لێی کۆڵیوەتەوەو ، هەندێ شەخصیاتی لەم مێژوە دەرهێناوە ، یەکێك لەوانە پالەوانی ئەفسانەیی ئەدەبی ئێرلەندەییە کە ناوی ( ڤین ) ەو ، ئەم ناوەی کردوەتە بڕگەی یەکەم لە وشەی یەکەمی ناوی ئەو رۆمانە دواییە ... بێجگە لە چەند قدیسو کاهینو شەخصیاتی تر ...**

لەم رووەوە دەتوانین بڵێین ئەدەبی جۆیس وێنەیەکی پانۆرامایی ئێرلەندەیەو هیچیتر .... وێنەیەکی ناودڕۆک داری قووڵی ئاقانەو فراوانو هەرچی لە مێژووی ئەم وڵاتەدایە تێدایەتی . .

بەم جۆرە ، تەنانەت لەو وڵاتانەدا کە بە ئارەزوو کردبوونیە شوێنی خۆی لە دەرەوەی ئێرلەندەدا . وێنەی ئێرلەندە لە جۆیس جیا نەدەبوویەوەو هەمیشە لە دەروونو مێشکیدا بوو ؛ بە رەوای نەدەزانی دەربارەی غەیری ئێرلەندە شتیتر بنووسێت . .

ئێرلەندە وەك دەریایەکی بێبنو پایان بوو کە جۆیسی زانا بە زانیارییەکی قووڵ هەموو شتێکی لێ دەردەهێنا . . هەروەها زوربەی زاراوە بڵاوبوەکانی لەوێدا بەکاردەهێنا . لەگەڵ وێنەی قەڵا جەنگییەکانو سروشتو شەقامو کەنیسەو قوتابخانەکان . بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا (جۆیس) تووشی دەردی گەڕانو هاتو چوو بوو . لە قووڵاییەوە هەستی دەکرد کە ئەگەر ژیانێکی فراوانترو دەوڵەمەندترو جووڵاوتر نەدۆزێتەوە ئێرلەندە ناتوانێ خواستە زۆرەکانی جێبەجێ بکات . بگرە رێی لێ دەگرێو دەیانخاتە ژێر چاڵ . بۆیە کۆڵی پێچایەوەو . بەرەو ناو جەرگەی ئەورووپا کەوتە رێ .

ئەمە چاوپیاخشاندنێکی پەلە بوو بەجیهانە بچووکەکەی ( جویس ) دا . وك « هۆدگارت » ناوی لێنابوو . کەواتە ئەی جیهانە گەورەکەی کامەیە ؟ . .

بێگومان جیهانە گەورەکەی جۆیس ئەورووپایە بە هەموو مێژوویەوە . هەر لە مەلحەمەکانی ( هۆمیرۆس )ەوە . کە لەسەر یەکێکیان ناوی ئەمردووی ( هۆمیرۆس ) جێگای خۆی گرت . هەتا دانتیو کۆمیدیا یەزدانییەکەیو .

شکسپیرو ئەدیبو خاوەن بیرەکانی سەدەی نۆزدەهەمو بیستەم . ئەورووپای پڕ لە ناکۆکیی، بەتەوابەتیو ئابووریو ئاینیو رامیاری ... تا ... د .

( جۆیس ) سالی ( ١٩٠٢ ) بارگەوبنەی پێچایەوە بۆ پاریس . کە لەو رۆژەدا قیبلەگای ئەدیبو هونەروەران بوو . توانی فێری زمانی فەرەنسی بیێو . دەستی کرد بەفێربوونی زمانە ئەورووپاییە تازەکانو . بەم جۆرە بیری خرپێلدی پزیشکی لە مێشکی دەرکردو . ورا زرده دەستی دایە فێربوونی هەمووشت لە بیروباوەڕی فەلسەفیو ئابووریو رامیاریو دەربارەی قوتابخانە هونەریو ئەدەبییەکان کە لە سەردەمی پێش وپاشی جەنگی جیهانیی یەکەمدا پەیدا ببوون .... هەتا سالی ١٩٤١ کۆچی دوایی کرد .

بێگومان جەنگ کارێکی گەورەی کردە جیهان . بە جۆرێ نەک تەنها هۆیەکانی دەربڕین ( تعبیر )و بیروباوەڕەکانی ئەو سەردەمەی گۆڕی. بەلکو تێکڕای نەخشەی رامیاریی ئەورووپای گۆڕی ...

( جۆیس ) چەندێ سوودی لە هەموو ئەمانە وەرگرت ؟ .. ( جۆیس ) زۆری پێناخۆش بوو کە بەشێوەی راستەو خۆ بیرو هەستی دەربڕێ .

دەربارەی هونەروەری راستەقینە ئەوە حسێب ناکرێ کە صەدان کتێبی خوێندوەتەوە . یا ئاگاداری ئەوەندە تیۆری زانیارییە . رۆشنبیریی هونەروەر شتێکی بناغەییەو . ئەو هەموە رۆشنبیرییە دەرژێتە چۆنیەتیی کاری داهێنەرانەیەوەو . شتێکی تەقریری رووت نیە . واتە :- دەبێ رۆشنبیری لای هونەروەر شوێنی شێوە بگرێتەوەو ببێتە هۆی تیژبینیو قووڵبینی. نەک بە شێوەیەکی راستەوخۆ بڕژێتە ناو نووسینو وێنەوە ..

( جۆیس ) لەم جۆرە بوو . بۆیە . بە شێوەی هێمایەکی لابەلایی نەبێ . نە پەنجەی بۆ ئەورووپای پارچە جوگرافییەکی سنووردار رادەکێشاو . نەئیشارەی بۆ ئەو بیروباوەڕانە دەکرد کە لەوێ رەواون . بەڵام ئەمە هەرگیز ئەوە ناگەیەنێت کە جۆیس ئاشنایەتییەکی فراوانی لەگەڵ ئەو رۆشنبیرییانەدا نەبوە . ئەوەتا بەشێوەی تێهەلکێش ( ضمنی ) کارەزانیارییە جۆبەجۆ کراوەکانی ئەورووپای دەخستە نێو کارە ریواییەکانیەوە . لە ریواتەکەی ( یولیسیز )یدا بەشێکی زۆر لە زانیاریی پزیشکیو . دەروونیو، ئەفسانەییو . زانیاریی ئاینیو ئەدەب رچاو دەکرێن . کە بەری راپەڕینە تازەکەی ئەورووپا بوون ...

ئەتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین کە رۆشنبیریی ( جۆیس ) رۆشنبیرییەکی ئەورووپاییانەیە . بەڵام ئەم رۆشنبیرییەی بۆ خزمەتی هونەرەکەی تەرخان کردبوو . ئێمە بۆیە ئەم لایەنە دووبات دەکەینەوە چونکە ئێرلەندە دواکەوتوو بوو . بگرە لە زوربەی گۆڕانکاریو زانیاریو شارستانیەکانەوە دوور بوو . لە رووی راستیدا ئێرلەندە بەشێک نەبوو لە ئەورووپاو . لە ولاتێکی دەستبەسەراگرتووی ئینگلیز بەولاوە نەبوو . کە دەیویست هەمیشە لەم گۆڕانکارییە دووری بخاتەوەو لە رکێفی خۆیا بیهێڵێتەوە !

ئێمە بەم شێوە پەلەیە وێنەیەکی دوو جیهانەکەی جوێسمان خستە بەرچاو ئەو دوو جیهانەی کە ( هۆدگارت ) باسی کردن . بەڵام ئاخۆ پاڵپشتو سەرچاوەی ( جویس ) هەر ئەم دوانە بوو ؟! ئێمە ناتوانین وێنەیەکی روونی دیاری ( جۆیس ) بکێشین بێ ئەوەی باسی رۆشنبیریو جۆگاکانی ئەم رۆشنبیرییەی نەکەین کە بەشێکە لە جیهانە فراوانە بەرینەکەی .. ئەوەی دەربارەی نووسراوە کتێبخانەیەکیان لێپێکدێ : بەشێوەیەکی ورد لە رۆمانەکانی دەکۆڵنەوە ، رابەریان بۆ چۆنیەتی خوێندنەوەیان داناوە . فەرهەنگی تایبەتییان بۆ داناوە ، سەرەتاو پێڕسیان بۆ کردوە، کتێبی تایبەتییان بۆ لێگەیشتنو راڤە کردنی هێماکانو ئەفسانەکانو زاراوە گەلییەکانیانو زمانە جیهانییەکانی داناوە . هەروەها بەراوردی مێژووی تایبەتییان بۆ ریوایەتی ( یولیسیز ) داناوە لەگەڵ ئەو سوودەی کە لە داستانەکەی ( ئۆدیسە )ی هۆمیرۆس وەك بنەرەتێك وەریگرتوە . سەرەڕای ئەوەش چەند لێکۆڵەرێکی گەورە گەورە لە لێکدانەوەی کەسانی رۆمانەکە قووڵداچوون، لە سەرووی هەموویانەوە ( لیوبولد بلوم )و ( ستیفن دایدلوس )و ( موللی بلوم ) . هەروەها هەندێ لە پسپۆڕەکان دەربارەی چۆنیەتی نووسینی ( یولیسیز ) کتێبیان داناوە ، لە سەرووی هەموویانەوە ( بۆدجن ) لەم بابەتەوە کتێبێکی داناوە بە ناوی ( جیمس جۆیسو دانانی یولیسیز ) پاڵپشتی لە دانانی ئەم کتێبەدا ئەو سرنجو نووسینە رۆژانەیە کە جۆیس خۆی نووسیونی . هەروەها گەلێك کتێبی تر هەن کە

باسی کاری جۆیس دەکەن لە ریوایەتی تازەدا . لە سەرووی هەموویانەوە کتێبەکەی ( روبرت مارتن ئادەمز )ە کە ناوی ( پاش جۆیس )ە . واتە : چەند لێکۆڵینەوەیەك لە رۆمان پاش ( یۆلیسیز ) . نەك تەنها ئەمە بەڵکو ( روبرت مارتن ئادەمز ) ئەو سەردەمەی رۆمانەکانی جۆیسی تێدا پەیدا بوون ناوی ناوە ( سەردەمی جۆیس ) بێ گومان قۆناغە مێژوویبە گەشاوەکەی ئەدەبی ئەورووپا کارێکی زۆر گەورەی کردوەتە جۆیسی داهێنەرو خستوویەتیە ناوەراستی جیهانێکی جوولاوو بزووتوو . وای لێ کردوە کە بکاتە ئاواتی خۆیو شێوەی تازەی دەربڕینی خۆی بدۆزێتەوە کە پێ ی دەوترێ تەوژمی وریایی .

**( جۆیس ) رۆشنبیرێ بووە لە بابەتە یەکەمەکانو ، چونکە بە باشی زمانە تازەکانی دەزانی راستەو خۆ بەباشی ئاگاداری هەموو کارە ئەدەبیە جێبەجێ کراوەکانو بیروباوەڕە تازەکان بوو ، بایەخێکی زۆری بە زانیاریی دەروون دەداو بەردەوام کتێبەکانی ( فروید )ی دەخوێندەوە ، بەتایبەتی کتێبی ( لێکدانەوەی خەوبینین )و ( طوطمو تابو ) . بەشێك لەو بایەخدانەی لە رۆمانی ( یولیسیز )و ( لەخەو هەستانی فینیجان )دا رەنگ دەداتەوە ..**

بێجگە لەمانەش ( جۆیس ) زۆر بایەخی بە میتۆلۆژیا دەدا . بگرە عەقلەکەی عەقلێکی میتۆلۆژی بور ، وەك زۆربەی رەخنە لێگرەکانی ( جۆیس ) دووباتی دەکەنەوە . بەبێ ئاشنایی یەکی قووڵ لەگەڵ ئەفسانەو جادوو ئایینو خەرافاتدا هەرگیز لە توانادانیە ئەو رۆمانە دوایینە بنووسرێت . جا لەم بابەتەوە ( جۆیس ) سوودی لە کتێبە بەناوبانگە دوانزە بەرگی یەکەی سیر جیمس فریزەر وەرگرتوە کە ناوی ( لقی ئالتوونین )ە . ( جیمس ) بە شێوەیەکی گرنگ ئاگای لە زوربەی باسە ئەنثرو پۆلێژی یەکانی سەردەمی خۆی بور .

لە دەیەکانی سەرەتای چەرخی بیستەمدا دوو زانای بلیمەت هەبوون کە کاریان دەکردە ئەدیبەکانو . هەریەك لەوان جەماوەری نووسەرانیان بۆ لای خۆیانو بیروباوەڕیان رادەکێشا ، ئەوانەش ( فرۆید ) و ( فریزەر ) بوون . یەکەمیان لە بابەتی زانیاریی دەروونو دووەمیان لە بابەتی زانیاریی ئەفسانەیی یەوە ، بەلام سەبارەت بە ( جۆیس ) بەشی زۆری بەڵگەکان ئەوە دەگەیەنن کە بە شێوەی سەرەکی ( فرۆید ) کاری تێ کردوە .

( جۆیس ) لە لایەنی ئەدەبەوە زور حەزی لە ئەدەبی ( دانتی )و ( شکسپیر ) و ئەدیبە ئینگلیزی یەکان دەکرد ، هەروەها زۆر بایەخی داوە بە ( فلوبیر ) و ( ئەبسن )و ، بەردەوام نووسینەکانی ( فلوبیر )ی دەخوێندەوە ، بگرە لە بەکارهێنانی دەنگە هەمە جوورەکانی بەشی هەشتەمی رۆمانەکەی مەدام ( بۆڤاری ) دا ، لە شێوەی ( فلوبیر ) زۆر سوودی وەرگرتوە ، کە لەو بەشەدا وەصفی پیشانگای کشتوکاڵی دەکاتو دەیەوێ چپەی دڵداران لەگەڵ دەنگی گاوگۆتاڵو ، خوتبە رامیاری یەکان لەگەڵ دەنگی مریشکو قیژەی منداڵو مرەی بەرازردا تێکەڵ بکات . ( جۆیس ) ئەم شێوەیەی لە بەشی دەهەمی ( یولیسیز )دا گۆڕیوە . کە دەبینین هەمان شێوەی لە تێکەڵ کردنو ئازوگوێزە کوتوپڕەکان وریایی کەسەکانی بەکارهێناوە . هەروەها لە یەکچوونێکی ئاشکرا لە نێوان ریواتەکانی (فلوبیر)و ( بوفارو بیکوشیە )و ریواتە ناوبراوەکەی ( جویس )دا بەرچاودەکەوێ . ( عەزرا باوەند ) هێمای بۆ ئەم لە یەکچوونە کردوەو ئەوەی باس کردوە کە بوفاروبیکوشیە لە بلومو دایدلوس دەچن .. بەلام ( لیونیل ترلنغ ) دووباتی کردوەتەوە کە بلوم نوێنەری عەقلی تازەیە . لە کاتێکدا کە پاڵەوانەکانی فلوبیر وەك ئەو نینو بەشتی بێ کەڵکی رۆژانەوە خەریکن . ئێمە زیاتر مەبەسمان بەراوردکردنی نێوان ئەم دوو ریواتە نیە ، ئەوەی زیاتر مەبەسمانە دەرخستنی ئەوەیە کە تا چ رادەیەك جویس لە فلوبیر سوودی وەرگرتوە ..

گوێدانو بایەخدانی ( جۆیس ) بە (ئەپسن) دەگەڕێتەوە بۆ رۆژانی لاوێتی ئەوە بوو هێشتا ١٨ ساڵان بوو کە لێکۆڵینەوەیەکی دەربارەی ئەپسن نووسی بەناونیشانی ( شانۆی تازەی ئەپسن ) هەروەها لە نووسینەکەیدا ( وێنەی هونەرمەند لە لاوێتی دا ) هێمای کردوە بۆ گرنگیو بەنرخی ی ئەپسنو باری ریالی ی لە وەصفداو دروس کردنی پاڵەوانەکان .

( جۆیس ) بایەخی داوە بە شانۆگەری ئەلمانی ( هویتمان )و لە سەردەمی لاوێتی دا دوو شانۆنامەی هویتمانی پەرجەڤە کرد . هەروەها بایەخی بە کورتە چیرۆکەکانی ( تشیکوف )و

ڕیوایەتی نووسەرە گەورەکانی رووسیادەدا .

نووســـــینەکانی ( زولا )ی دەخوێندەوەو ، بایەخی بە نووسەرە رەمزی‌یە فەرەنسی‌یەکان دەدا، بەتایبەتی ( مالارمیە ) ، بێجگە لەمانەش بایـەخی بە ئەدەبی ئەڵمانی دەدا .

لە بابەتی مۆسیقاشدا ( جۆیس ) حەزی لـە مۆسیقای ( فێردی ) و ( موزارت ) و ( فاغنەر )و مۆسیقا درێژە پڕ لە هەراکەی زۆر پێ‌جوان بوو ، ئەم گوێ‌پێ‌دان‌و بایەخ‌دانەی (جۆیس) بە مۆسیقا بەشێوەیەکی گشتی لەوەوە هاتبوو کە گۆرانی لا بەنرخ بوو زۆر گوێی پێ دەدا ، ئـەوە بـوو لـە سەرەتای ژیانیدا ویســـــتی وەك گۆرانی بێژی رێگای خۆی ببڕێ ، بەڵام پاش ئەوەی لە یەکێ لە میهرەجانەکانی گۆرانیدا لە خوێندنەوەی نۆتەکەدا ســـــەرنەکەوت و پاداشـــتی وەرنەگرت ، ئیتر بەئێجگاری وازی لە گۆرانی هێنا . .

مۆسیقا کارێکی ئێجگار توندی کردە جوێس لە گڵاڵەکردنی هەستی ئیقاعی‌ی ئەو دەنگانەی کە بە شێوەیەکی خەست لە ڕیوایەتە دوایینەکـەیـدا بەکاری‌هێنا بوون .

بەردەوام ســـــەیری ئەو بالێیانەی دەکرد کەپێشکەش دەکران . لەســـــەرووی هەموویانەوە تیپی هونەرمەندی رووسی ( دیالیف )و سووڕدەری بەناوبانگی تیپەکەی کە ناوی ( بخنســـکی ) بوو .

( جۆیس ) بایەخی بـــە بزوتنەوەی تازەی هونەرە تەشکیلی‌یەکان دەدا ، بەتایبـــەتی کـــارە هونەری‌یەکانی بیکاسۆو ستراڤنسکی . . .

**سالی ١٩١٦ لە زیۆریخ بوو کە بزوتنەوەی ( دادایی ) سەری هەڵدا ، ئەو بزوتنەوەیە کـــە شاعیری رۆمانی تریســـــتان تزارا ) و وێنەگری ئەڵمانی ( هانز ارب ) دایـــان هێنـــاو ، لەگەڵ وێنەگری فەرەنسی ( دوشامب ) سالی ( ١٩١٨ ) یەتیان گرت‌و ، دوای ئەوە بەسالی هەموویـــان چوون بۆ پاریس‌و ، لەوێ گەلێ لە ئەدیبان هاتنـە پاڵ ئەم بزوتنەوەیە ، لە ســـەرووی هەموویانەوە ( ئەنـدریـە بریتون ، بول ئیلوار ، ئـەراگـۆن‌و ، بزوتنەوەکە بارێکی ئەدەبی‌ی ئاشکرای وەرگرت‌و، بەوە دوایی هات کە سالی ( ١٩٢٤ ) سریـــالیەت دامەزرا ، دوای ئەوەی ( بریتون ) بەیانی یەکەمی سریـالیـەتی دەرکردو ، ئەم‌سریالیەتـە بـەدوای**

**بناخەو بنەچەی خۆیدا دەگەڕا لای ســـــویفت‌و دی‌سادو لویس کارول‌و رامبۆو خەڵکی‌تر .**

بێجگە لە ئەوەش کە ئـەم رێبازەپشتی بـە داهێنانەکانی فرۆید دەبەست کە لە بابەت خـەو بینینەوە دای‌هێنـــابوون ، ( جۆیس ) توانی بـە وردی هەنگاو بەهەنگاو سرنجی ئەو رەنجانە بدات کە چووبوونە ژێر ئاڵای ســـــەرکردایەتی‌ی ئەم بزوتنەوەیەو ، ماوەی بیست سال ژیانی ئەدەبی‌ی ئەورووپایان هێنابوویە لەرزین .

( جۆیس ) لەگەڵ ئەوەشدا کە بە شێوەیەکی بنەڕەت بایەخی بە مەســـــەلەی خەوبینین دەدا ، بەتایبەتی لە رۆمانە دوایینەکەیداو لە بەشـــــی پانزەهەمی ڕیوایەتی ( یولیسیز )ی دا ، کـە بـە گەورەترین بەشی رۆمـانـەکـــە دەژمێردرێت . بەڵام نەرۆیشتە نێو بزوتنەوەی سریالیەوە ، بگرە هەڵوێستێکی دوورە پەرێزانەی بەرامبەری هەبوو، هەرگیز خۆی بەونووسینی میکانیکی‌یەوە خەریك نەدەکرد ، کە سریالیـەت دووبـــاتی دەکاتـەوە . بەتیبینی هونەروەرێکی زاناو بلیمەت دەیزانی کـە ئـەم بزوتنەوەیە دوایی لووتی دەدا لـە رێگایەکی گیراو، بێ‌گومان ئەم بۆچوونەی بەراست دەرچوو، ئەوە بوو ( ئێلوار ) لەم بزوتنەوەیە دەرچوو بوو بە گەورەترین شاعیری گۆرانی‌ی فەرەنســـە ، هەروەها ( ئەراگۆن )یش دەرچوو ، بە هەوڵ‌ورەنجی ( جان کوکتو ) سالی ١٩٣٠ سریالیەت گواســـــتیەوە بۆ ســـــینەماو ، جۆیس بۆ کارە هونەری‌یەکانی دوایی‌ی ســـــوودی لەم لایەنە وەرگرت لە تێکەڵ کردنی وێنەو مێردەزمەکاندا .

جۆیس بایەخی بە هەموو ئـەو بەرهەمانـە دەدا ، کە لەو ماوەدا ئەورووپا هێنابوویە بەرهەم‌و پێشـــــکەشی‌کردبوو . ئەمانە هەموو بوو بوونـە بەشێك لە تێکڕای رۆشنبیری‌یەکەی .

جۆیس هونەرمەندێکی تیژ بین بوو ، لـــە چەشنی ( ت. س. الیوت ) بوو ، بەشـــنی بێ بەقاوە خۆی نەدە بەستەوەو ، رێگای خۆی بـــە بێ‌دەنگی‌و لەسـەرخۆیی‌و دامەزراوی‌یەکەوە دەبڕی، کە لە کەم هونەرمـــەندی داهێنەری تردا بـەدێ دەکرا . . جیهانەکەی - بیابانی بێ‌ســـــەرو بنی چەرخی بیســـــتەم - لە هەنگاوەکانیەوەو لـــە هەستەکانیەوە دەستی‌پێ‌دەکردو لە ســـــەرڕا دەڕایەوە ، هـــــەر لەبەر ئەمەیە کە دەبینین لە ســـــەرەتاوە ســـــادەو رێك‌وپێك بوەو خەڵك تێ‌ی‌گەیشتوە ، لەپاشاندا هەتا تەمەنی زیاتر دەبێ پێچ‌وپەنادارترو ئاڵۆزاوتر دەبێ . .

( جۆیس ) بە هەموو پشت ئەستووری باوەر بە خۆیی‌یەکەوە لەسەر ئەم رۆشنبیری‌یە بانوپۆرە چوار مەشقی دابوویەوەو ، ئەم رۆشنبیری‌یەی خستبوە ژێردەستی پێنووسەکەیەوە .

( هۆدگارت ) هەر بەمەوە راناوەستێ ، بەلکو هەولی ئەوەی داوە بچێتە ناخی ژیانی لەشی‌و ئەندەروونی‌و نەخۆشی‌و ئازارەکانی جۆیسەوەو ، دەیەوێ ئەم رێگا تارێکە بە روونکردنەوەی هەندێ بەشی جیاجیای لەشی جۆیس بدۆزێتەوەو ، دەیەوێ بە داهێنەری‌یەکەی جۆیسەوە ببەستێتەوە .

بچوکترین جیهانە ژیاندارەکانی جۆیس لەشەکەیەتی ، جۆیس زۆر گوێی دەدایە ئەم جیهانە تایبەتی‌یەی ، لە راستیدا رۆمانەکەی ( یولیسیز ) تەنها بریتیە لە داستانێك لە داستانەکانی لەشی ئادەمیزاد ، ئەمەش ئەنجامی ئەوە بوو کە جویس زۆر گوێی دەدایە زانستی کاری ئەندامەکان ، ئەم گوێ پێدانەی لەو بەشەیدا کە ناوی ( گاجووتەکانی خ-ـ )ە بەتایبەتی دەردەکەوێ . .

( جویس ) هەرگیز بیری جیاپی عەقل‌و لەشی بە خەیالدا نەهاتوەو ، هەروەکو ( بودجن ) لە کتێبەکەیدا کە دەربارەی شێوەی نووسینی ( یولیسیز ) نووسیویەتی دووپاتی دەکاتەوە ، زالبوونی هەستەکانی سەربەلەش لەم ریوایەتەدا

گەلێک کلیل دەداتە دەس مرۆی لێکۆلەر بۆ کردنەوەی لەغەزی شەخصیەتی مرۆڤ . گومان لەوەدا نیە کە ئەم رۆمانە ، بەو شێوەی کە بەرچاو دەکەوێت ، بە زەحمەتێکی ئێجگار سەخت‌وگران نووسراوە ، بەتایبەتی لەبەر ئەو هەموە زانیاری‌یە زۆرانە کە تێدایەتی دەربارەی لەش ، ئەمەش شتێکی ئاسان نەدەبوو ئەگەر ( جۆیس ) لەبابەتی کارلەیەك کردنە گرنگەکانی نێوان لەش‌و عەقلەوە زۆر زانانەبوایە . .

لێرەدا ، ئەگەرچی جامبازی‌یەکی پڕ لە مەترسی‌یەو ، لەوانەیشە ئاخری خێرنەبێت . شتێکی لە باروگونجاوە کە بلێین : ( جۆیس ) لە پێش هەموو شتێکدا بەدمەستبوو . هەمیشە شەرابی دەخواردەوە !

ئێمە زۆر باش ئەوە دەزانین کە وشەی ( بەدمەست ) لە باسی نووسەرێکی گەورەی وەك ( جۆیس )دا وشەیەکی گران‌و بە ئازارە . بەلام لە راستیدا ( جۆیس ) بەدمەست بوو . گیرۆدەی خواردنەوەی توندترین جۆری شەراب بوو کە عەرەقە ، ئەم جۆرە دووەم ئۆکسیدی گۆگردی تێدایە لەگەل ماددەی کیمیایی‌تر لەو ماددانە کە مەعیدە ( گەدە ) ئالۆزدەکەن‌و تێکی‌دەدەن . . . ئەم زۆر خواردنەوەیە بەشێوەیەکی راستەوخۆ کاری تێ‌کردو بوو بە هۆی ئەوەی مەعیدەی ( گەدەی ) تووشی قورحە ببێت‌و . هەر بەو نەخۆشی‌یەش مرد !

هەروەها هەمیشە خواردنەوەکەی لە لایەکی ترەوە کارێکی تری تێکرد . ئەوەش ئەوە بوو کە غیرەتی جینسی دەبزواند ، ئەو غیرەتە لە نامە یەکەمەکانیدا بەرچاو دەکەوێت کە بۆ ( نۆرا )ی ژنی نووسیبوون .

هەر ئەم غیرەتەشە کە بوەتە بناخەی شانۆنامەی ( دەرکراوەکان )و بوەتە خەیالێك کە تێکرای ریوایەتەکەی ( یولیسیز )ی داگیرکردوە ، کە لای بلوم هەست بەم غیرەتە دەکەین لە شێوەی گرێی دەروونی مێردی دەویتدا ، بەتایبەتی لە خەیالە سەرکەشەکانداو ، لەبینینە یەك لە دوای‌یەکەکاندا لەبەشی ( سرسە )دا هەمووی . ئەمەش هەمووی هەولی خۆپاك کردنەوەیە لەغیرەت ، بەرامبەر بەوەش ( بلوم ) دەبینین هەست بەوە دەکات کە ( بویلان )ی دۆستی ژنەکەی ئێستە لایەتی . لە پاشاندا خەو بەوەوە دەبینێ کە ناوی لە لیستەی مێردە دەویتەکاندا لە رۆژنامە بەیانیانەکانی ( دبلن )دا بلاوبوەتەوە .

سەرومڕ خواردنەوەی عەرەق : زووبێ‌و درەنگ ، دەبێتە هۆی غیرەتی جینسی‌ی تیژ ، من گومانم هەیە لەوەدا کە ( جۆیس ) بەهۆیەکانی غیرەتەکەی زانیبێت ؟ لەگەل ئەوەدا کە زۆر باش زانیویەتی ئیشی وەها لە کۆمەلدا شتێکی جوان‌و حەزلێ‌کراو نیە !

یەکێتر لە ئەنجامەکانی هەمیشە خواردنەوەکەی ( جۆیس ) ئەوە بوو کە تووشی مۆنی‌و شێوە بەزاراوی‌یەکی قوول بووبوو . بەلێ ( جۆیس ) لە لاوێتی‌دا لەگەل زۆر خواردنەوەیشیا لەش بەهێزی‌و بەرچاو فراوانی پیشاندەدا . بەلام کە گەیشتە تەمەنی چل سالی مۆنی‌یەکەی رەگی داکوتاو زۆری پێ‌هێناو بەسەریا . . . زالبوو بێ‌گومان رۆمانی « لە خەوهەستانی

فینیجان «ی دەربڕینی ئەم مۆنی‌یە بوو .

یەکێک لەو هۆیانەی کە سەرودڵی داگیرکردبوو ئەوە بوو کە کچەکەی لە تەمەنی (۲۰) ساڵانی‌دا تووشی نەخۆشی‌ی ( شیزوفرینیا ) بوو . نەخۆشی‌ی ئەم کچەی کارێکی زۆری تێ‌کردو بوە هۆی گەلێ ئازاری دەروونی‌ی ( جۆیس ) .

سەرەڕای ئەمانەش هەموو هەر لەکۆنەوە چاوەکانی هەمیشە ئازاریان دەداو ، بۆ ئەوەی لە کوێری رزگاربێت دەبوا عەمەلیاتێکی جەراحی ئازار دەری چاوەکانی بکردایەو ، ئەمەش لە هەمووشت زیاتر دەیترساند ..

بەڵام مۆنی‌یەکەی ( جۆیس ) ناتوانرێ بە تەنها لە بەر رووناکی هۆ دەرکی‌یەکاندا لێک‌بدرێتەوە ، چونکە هەستی زۆر بەرزی بەسەربەستی‌ی خۆی دەستێکی گەورەی هەبوو لە تەشەنە کردنی مۆنی‌یەکەی‌دا . خۆی دەیزانی کە زیاد لە ئەندازە مۆنە .

سێهەم شت کە کارێکی گەورەی کردبوە سەر ( جۆیس ) ئەوەبوو کە تووشی دەردی قسەبزرکاندن‌و قسەی هەڵەق‌مەڵەق بووبوو ، ئەگەرچی کاری ئەم دەردە وەك کاری هەمیشە خواردنەوەکەی کاریگەر نەبوو .. دوور نیە ئەم دەردە بوو بێتە هۆی گرتنی ئەو رێگایەی کە لە بەکارهێنانی دەنگەکاندا لە رۆمانە دوایینەکەیدا گرتبوویە بەر ، زیادە ڕەویش ناکەین ئەگەر بڵێین: ئەم رۆمانەی بریتیە لە چەند دەنگێکی تێکەڵ‌وپێکەڵ‌و بەیەکاهاتووی لێ‌تێ‌نەگەیشتوو ، چەند دەنگێک کە پچڕپچڕ دەبێت ، ئیعتیراف دەکات ، هەڕەشە دەکات ، وڕێنە دەکات .... لەگەڵ ئەمانەشدا هەمووی هێزی بیر ( ذاکرة)ی جۆیس یەکێک‌بوو لە هێزەبیرە تایبەتیەکان لە مێژووی ئەدەب‌داو ، بە وریایی‌و بەهێزی مایەوە تا ئەو رۆژەی ئەم نووسەرە گەورەیە بۆ ئێجگاری چاوی لەیەک ناو کۆچی‌دوایی‌کرد !! ...

هەمیشە خواردنەوە شتێك نیە بە میرات بۆ مرۆڤ بێتەوە ، کەچی هی وا هەن ئەم مەسەلەیە دووپات دەکەنەوە، جا تۆبڵێیت ئەم زیادە رەوییەی ( جۆیس ) لە خواردنەوەدا لە هەمیشە خواردنەوەکەی باوکیەوە بە میرات بۆی هاتبێتەوە؟ کە باری ئابووری‌ی خێزانەکەی بە خەرجی‌ی خواردنەوەی خۆی مانووکردبوو ، لەوانەیە ئەمە راست‌بێت ...

( جویس ) زۆربەی بەشەکانی « لەخەو هەستانی ( فینیجان )ی بەشەودا نووسیوە ، ئەوەش وا‌تا : لای کەمی نیوە سەرخۆش بووە .

شتی وەها پاش ( بایرون ) بەدەگمەن رووی‌داوە ، کە وەك دەگێڕنەوە وتوویە : کتێبی ( دون جوان )ی لە ژێرکاری شەرابی ( جن ) دا داناوە .

( جۆیس ) لەلای سەرووی لیستەی نووسەرە هەمیشە شەراب خۆرەکانەوە دادەنرێت .. ئەم نەریتە لە سەدەی بیستەمدا لەچاو سەردەمی ( بایرون ) دا گۆڕانی بەسەردا هات .

بێ‌گومان ناتوانرێ واز لەناوی چەند ئەدیبێکی داهێنەری وەك ( فوکنەر ) و ( هەمینگوای ) و ( سکوت فتزجرالد )و چەند نووسەرێکی‌تر بهێنرێت ، بەڵام ( جۆیس ) بوو بە قوربانی ئەم هەمیشە خواردنەوەیە ، کە ئاخری کوشتی !!

( جۆیس )ی مرۆی رۆشنبیرو ئێرلەندەیی‌و ئەورووپایی یەك پارچەی تەواوەو ، هەمووی دەڕژێتە ( جۆیس )ی رۆمان نووس‌و تیایا دەتوێتەوە .

**زۆربەی رەخنەلێگرەکانی ( جۆیس ) ئەوە دووپات دەکەنەوە کە رێك‌خستنی هەموو ئەمانە بە شێوەیەك بوو کە لە توانای کەس‌دا نەبوو .. ( جۆیس ) توانی ئەم زانستە قووڵەی بخاتەکار لەگەڵ جم‌وجووڵی کەسەکانی‌دا بێ‌ئەوەی ئەدەبەکەی خراپ بکات‌و نووچاری دەردی راپۆرتکاریی بکات .. جادەکانی دەپێوا ، پەنجەرەکان‌و گالیسکەکانی ترام‌و بارەکانی شەراب‌و کۆڵانە کۆنەکانی ( دەبلن )و دەروازە کۆنەکانی هەموو دەژمارد ، جیهانێکی گەورەی دروست کردبوو کە باوەڕ ناکەم کەس بتوانێ بە ئاسانی تێی‌بگات ئەگەر ئاگای لە شەخصیەتی جۆیس ، بەتایبەتی بارو دۆخی کۆمەڵایەتی‌ی ئێرلەندە هەمووی‌و ، شێوەی بیرکردنەوەی ریوائیانەی جۆیس نەبێت .**

ئەمە چاوپیاخشاندنێکی زۆر کورت بوو دەربارەی جۆیس ، ئەگەر بەراورد بکرێت بە جیهانی فراوانی نووسەرێکی گەورەو ، بەم نووسینە لەوانەیە کەمێکمان باس‌کردبێ لەوەی کە پەیوەندی بە جیهانەکانی جۆیسەوە هەیە ، وەك ( هۆدگارت ) دووپاتی کردوەتەوە .

# ئامێردەکان

محمد موکری

" ـ ئەوەتا ... خۆیەتی ، هیچ گومانی تیادا نی‌یە ... خۆیەتی ، چەند سرکە ئەوەتا ، کەخۆمی لێ گێل دەکەم ، بەلا چاوەوە سەیری سەرتاپام دەکات ، خۆیەتی ... ئەوە نی‌یە سەیری دەکەم دەشلەژێو سەرنجەکانی دەگوازێتەوەو خۆی گێل دەکات ... ئەوەتا کراسەکەیشی داوەتە سەر بانتۆلەکەیەوە ، بە ئاشکرایش لە ژێر کراسەکەیدا دیارە.. ئەوەتا کەلەکەیشی چەند قۆقزە ، دوریش نی‌یە لەسەر پێ دایبنابێ ... سەیر سەیر چۆن دەم‌وچاوی رەشهەلگەڕاوە ، خۆ ئەوەندە بە تەمەنیش نی‌یە ، کەچی لۆچەکانی دەم‌وچاوی ، گرژی‌یەکەی هەر ئەوە دەنوێنێ لەنگەری نالەو هاوارو فریادکێشانی نیچیرەکانی دەستی لە نێو ئەو لۆچانەدا ئارامیان گرتبێو ناو بە ناویش نالەو هاوارەکان لەو لۆچانە دەربەڕن وڕو لە خەوبینین‌و حەسانەوەکانی دەکەن ودەبشێوێنن‌و شەونخونی پێ دەسپێرن ...

ئەوەتا ... چەند لاوازو رەقەلەیە ماندویەتیش لکاوەتە لەشی‌یەوە ... چەند سرکە ، ئەوە نی‌یە سەرە تاتکێ دەکات کە گوێی لە دەنگی شوتی ماشینەکانی نەجدە دەبێ ... وادیارە چاوەڕێ دەکات ...

زەحمەتە ئەمشەو دەرباز بم ، چەند بەوردی سەرنجم دەدات ، هەر ئێستا لێم نزیک دەبێتەوە، یەکسەر بێ سێ‌ودوو داوای پێناسم لێ دەکات.. دور نی‌یە نەخوێنەوار بێ .. ئیتر گێچەڵێکم پێدەکات ، هەر هیچ نەبێ وەکو عەلی هاوڕێم دووچاری شتێکی سەیرم دەکەن ... ئەرێ .. خۆ پێری‌شەو عەلییان لەسەر تەلافەت برد ... دور نی‌یە ئەویش وەکو عوسمانی برای سەرنگون بکرێ .. خۆ عوسمان ، تەنها لەبەر ئەوەی بە زەلامێکی وەکو ئەمەی بەرانبەرمی وتبو ( برا منیش دوو چاو و یەک دەم‌و یەک لوت‌و دوو دەست‌و دوو پێ‌و سیودوو دگانم هەیە ) کەچی لێی کۆبوونەوە ، پێیان سەیر بو ، چۆن لەم سەدەیەدا ، لەم شوێن‌و جێیەدا ، قسەی وا دەکرێ .. ها .. !!

باوەڕ ناکەم دەرباز بم ... جا بۆ کوێ بچم. بۆ کوێ ؟ لە پەناییکدا هەر فریام دەکەوێ .. پەلە ناکات .. رەنگە مەبەستی بێ کەس چاوی پێوە نەبێ .... ئا ... ئا ... ئەوەتا هەڵسا .. ئا .. چاك بو بەرەو تەوالێتەکە رێی گرتە بەر .. تا نەگەڕاوەتەوە .. تا زووە ، با هیچ لە گیرفانەکانمدا نەهێڵم .. با بە پەلە پێناسەکەم دەرکەم ، ئەو دەفتەرە بچکۆلانەی گیرفانم بدڕێنم‌و تورِی هەڵدەمە لایەکەوە .. چاکە خۆ دەفتەرەکە شتێکی ئەوتۆی تیادا نی‌یە تەنها ژمارەی تەلەفون و ناونیشانی هەندێ لە هاورێکانمی تیادایە .... ئا .. ئا .. هەر باوەڕ ناکەن کە ئەمانە ژمارەی تەلەفۆنی هەندێ هاوڕێی چایخانەو کتێبخانەو مەیخانەو خانەو خانەکانی ترە .. ئا .. ئا نەخێر .. هەر دەرفەتی ئەوەم نادەن قسە بکەم ... گریمان

رێیان دامێ .. جا چی بڵێم ... هەر چی‌یەك بڵێم ئەوا قورِەکە خەستتر دەکەم ، گەر بڵێم بێ تاوانم ، ئەوا دەڵێن بۆ .. بۆ .. ؟ هەر چی‌یەک بڵێم ئەوا دەڵێن بۆ ... ئیتر هەر بەزیندویەتی پێستم دەکەنن‌و کەولم دەکەن‌و پێستەکەم خۆشە دەکەن‌و دەیکەنە چەرمی دەهۆڵێ‌و گوێی من ئاساکانی پێ دەهەژێنن ، لاقێکیشم بە مشارێ کەل دەبڕنەوە ودەیکەنە ئەو دارەی دەهۆڵەکە دەکوتێ‌و ئیسقانی باسکیشم بە درێل کون‌کون دەکەن‌و دەیکەنە جوزەلەو لەفیستڤالێکدا دەمکەنە کەرەسەی ئاهەنگ‌و ئاهەنگیش بۆ جەربەزەیی‌و بە جەرگی ئەو میللەتانە دەگێڕن کە بێ وڵات‌و بەشخوراوو چەوساوەو چادرنشینن‌و تێدەکۆشن !! .. چ سەیرێکە ... گەر هیچیش نەبێ وەکو قاچاغچێیێک لە قەڵەمم دەدەن‌و لە تەلەفزیۆنا بە سەر تاشراوی دەرم دەکەن !!!

چاکە تا کار لە کار نەترازاوە فریای خۆم کەوم .. ئەگینا سەرم لێ‌تێک دەدەن‌و ناچار دەبم بێ لەو تاوانانە بنێم کە لە هیچە بۆمی دروست دەکەن ئیتر تا دوا هەناسەم دەبمە نێچیری

گیرودەی تەڵەی گومان ودوو دڵیو ڕاڕایی پاشانیش باوەڕم بەخۆم نامێنێو خۆم بەبێ سەنگو ڕەنگ دەزانمو لە بەراوێزی ژیاندا هەر لەخەمی سکو خەو و خواردنەوەدا دەبم ... چاکە تا توش نەبووم با گیرفانەکانم بەوردی پشکێنم نەوەک خێرخوازێک شتێکی تێ ئاخنی بێ‌و پیم نەزانی بێ !! .

ئا .. ئا .. ئەوەتا گەڕایەوە ... لەسەر مێزەکەیدا دانیشت .. بەلاچاوەوە سەرنجم دەدات .. ئەوە خۆ هەر تف فوت دەدات .. ئای بەستەزمانە .. دوور نی‌یە خاوەنی کۆشی خێزان بێ .. ئەشێ ناچاریش بێو ئەم کارەی پێ بەسەند نەبێ ڕەنگە ئەوەندە بە تف لەئاوێنەدا ڕوخساری خۆی سوواخ دابێ ؛ ئەترسێ تفی پێ نەمێنێو ئاوێنە سوواخ دراوەکەش ڕەنگی نەداتەوە ..

**« کێ دەڵێ : لەسەرەتادا « ئەم بەستەزمانە » بۆ چەند پارووە نانێک ڕوی لەم کارە نەکردووەو پاشانیش ڕوژ بەڕۆژ وەکو ئامێرێکی لێ نەهاتووە .. ئەشێ هەموو بیرکردنەوەیێکی لەوەدا کۆ بوبێتەوە کە سبەی یادووەی ئەم جەستە ئامیر ئاسایەی لە کار بکەوێ ؟؟**

**کێ دەڵێ : باروسەردەم ڕوو لە ڕۆخو بنارێکی دی ناکات و ئەم نابێتە نێچیر ، ئەوەی نێچیرەکانی دەستی ئەم ئامێرە دەوری قەسابو ڕاوکەر وەرناگرن ... گەر لە ژورێکی تاریکدا داینێن‌و دەست‌و پێی ببەستنەوەو لەروی پانکەو گازو پەمپو پلایسیی نینۆک کێشان‌و مشارو چەقۆ و مرەی سەگە پۆلیسیەکاندا ڕایگرن و هیچی لێ نەکەن ، تەنها ئەم شتانەی پێ نیشان دەن ، کە لەمەو بەر بە چاوێکی دی‌و بە جۆرێکی دی تەماشای کردون .. هیچی لێ نەکەن .. با سەیریان کات‌و بەس .. ئای کە زەندەقی دەچێ‌و کوت‌وپڕ گیان دەداتە دەستەوە .. باوەڕیش ناکەم بە بزەوە وەك ڕۆبسپیر ڕوو لە مقصلە بکات .. نا ..**

**ڕۆبسپیر شۆڕشگێڕێکی خاوەن مەسئەلەبو ..بەلام ئەم زەلامەی بەرانبەرم جەنگاوەرێکی گرێ گرتەی ( نانە ) ... ئەرێ بشێ لە خەوبینینیدا ئەم کەرەسانە بە بەر چاویا تێنەپەڕێ ؟**

برسی هەمیشە خەون بە نانەوە دەبینێ . دیل بە سەربەستی ؛ نەخۆش بە ساغی کوێر بە چاو .. ئەرێ جا بۆ قەساب یا سبخور ، یا چاو ساغ . سەربەست . . تێر . . خەون بەوەوە نابینن بن بە نێچیر ، دیل ، نەخۆش ، کوێر .. جا .. بو ؟؟ ڕۆژگارەو کار دابەش دەکات .. !!

کێ دەڵێ ئەم زەلامە ئامێرەی بەرانبەرم لە شوێنێکی دیدا نەدەبووە کەسێکی سود بەخش؟ .. نا .. باوەر ناکەم .. هەرگیز باوەر ناکەم ڕۆژگار ئەوەندە حوکمی قورس بێ‌و ماوەی سەرپشک بوون نەداتە دەست کەسانەوە .. ئەمە خۆی لاوازو ترسنۆکو بەدفەڕە .. خۆی خوێری‌یە .. خۆ ئەمانەش بەزگماکی لە گەڵیا نەبوون .. نەخێر ئەمانەی لە نێو ئەشکەنجەو ئازاردا بژارکردووەو پێی قایل بووەو سەرشۆڕو مل کەچیانە ..

ئەوەتا .. چ مژێکی قولی لە جگەرەکەیدا .. سەیر سەیر دەم‌و لوتی دەڵێی تونی کارگەیە چ دوکەڵێ دەردەپەڕێنێ .. ؟ چۆن خێم لێ دەکات ؟ . کە لە تەوالێتەکەش گەڕایەوە بە هەمان جۆر خێسەی لێ دەکردم .. سەیر دەبێ لە تەوالێتەکەدا دەری کردبێ‌و دڵنیا بوبێ لە دروستی‌ی !! ڕەنگیشە چەن جارێ ئەم دیوو ئەو دیوی پێ کردبێ و بە پشتێکی گەورەی خۆی زانیبێ ... دوریش نی‌یە لولەکەی ماچ کردبێ‌و بە چیەوە پێی وتبێ :

**ـ نالەیبڵی تۆ .. نێچیرێکی دی دەخاتە نێو لیستەی نێچیرەکانمەوە !!**

ئەوەتا .. دەستی بۆ پێکەکەی برد .. سەیر سەیر چەند بێ دەربەستانە فڕی کردو هەڵیدا .. چ بێ دەربەستێکە .. ئای بەستەزمان :

**( ئەوا من ئێش بووەتە چەشەی قولاپی مەیخانەکان‌و داوی ناچاری هەنگاوەکانم پەلەکیش دەکات‌و لە کونجێکا لەنگەرم پێ دەگرێ ... زۆر جاریش سەرەڕای پێویستیم ڕو لە ئێش و ژان ناکەم‌و دەم بۆ چەشەکە نابەم ، نەوەك هەڵەشەیی‌و جنێوفرۆشی‌و توڕەیی بمگرێتە خۆیەوە .. نەخێر هەر تەنها ئێش‌و ژان نی‌یە من بۆ ئەم مەیخانانە ڕادەکێشێ .. ڕەنگە بمەوێ مانا بە گەوجی‌یەتی‌و پێکەنینە ساردەکانم بدەم .. ڕەنگە بمەوێ خەون نەبینم ، ئەوەندە مەست بم هەر بەڕێوە سەرخەو بشکێنم ...**

جونکە لەکاتی مەستی‌و سیامەستیمدا

حەونەکانم لەبیر دەچێتەوەو بۆم دووبارە دکرێتەوە ... بەهەر حاڵ نازانم تەنهـا تەنهایی ی بە روم تێدەکات وا منیش رو لە مەیخانەکـان دەکەم .. » .

بەچ رقێکەوە سەرنجەکانی دەتفێنێتە سەرمەوە ... خۆ نایناسم دڵنیاشم نامناسێ ، ئەزانێ ناحەزیشی نیم ، رەنگە هەست بەوە بکات کە لە بیابانێکدا بە تینوێتی بمێنێتەوەو منیش تەنها دوو قوومە ئـاوم پێ بێ قومێکیانێ دەدەمێ بێ ئەوەی لە ناو کاری بپرسم ...

ئەوە خۆ هەر بەلا چاوەوە سەرنجم دەدات ، مو بە مو لە مێشکی خۆیدا وێنەو قەدو رەنگم هەڵدەکۆڵێ .. ها ... ئەوەتا .. جارێکی دیش هەڵسایەوە ... با چاوی خۆمی لەسەر لادەم ئەوەک بزانێ منیش بەدزییەوە سەرنجی دەدەم و کەوتوومەتە گومانەوە .. چاك وایە خۆمی لێ گێل بکەم .. با بەگێلم تێ بگات ، هەر کە لێم نزیك بووەوە ئەوا بە کوردی پێی دەڵێم زمان نازانم .. هەی قورِ بەسەرم گەر وابڵێم ئـەوا ..... وەیوەی ..

نە .. هەر بەزمانە فارسی یەکەی خۆی ورەوانتریش وڵامی دەدەمەوە وروم خۆش دەکەم بزەیشی بۆ دەکەم .. نـا .. نـا .. پێناکەنم ، دەکەوێتە گومانەوە ، هەست دەکات لە ترسانا وادەکەم ، ئیتر سەد پەلپ‌و بیانوم پێ دەگرێ‌و لە کۆڵم نابێتەوە ... بە هەر حاڵ با نزیکم بێتەوە چۆن رێککەوت ئاوها دەکەم ... ئەوە بۆ نەگەیشتە لام ؟ خۆ نێوانمان هەر بیست مەتر دەبیت ، با سەرم بەرز کەمەوە .. نا .. نا .. نەخێر ئەمجارە هەر لە سەر هیچ نەبێ دەڵێ بۆ سەیرم دەکەی .. ئیتر .. چی بڵێم .. وەی گەر قسە بکەم وەی گەر قسەیش نەکەم ..

ساماڵ ـ یان کوشت لەبەر ئەوەی قسەی نەکردو هیچی نەوت .

شەماڵ ـ یان کوشت لەبەر ئەوەی ، ئەوان هەر چی‌یەکیان دەوت ئەمیش دەیوت بەڵێ وایە وابووە .. قادر هەر فریا نەکەوت نە بێ دەنگ بێ ونە قسە بکات ، کلۆڵە زراوی ئەقی ، رەشید ، حەمید ، خەلیل ، فەرهاد ، حەمە رسول ، لەبەر چاوی یەکدیدا سەریان دەبڕین .. سەعد سەمیر جەواد ، بەهمەن ، هوشەنگ ، وەی وەی ئەمانەیان بەرانبەر بە کامیرایێك راگرت ، چاوسوریکی گەردن کلفتیان هێنابو ، تێیان بەر بو و پاشانیش بەلاستیکی دەربێ. کورتەکانیان لەغاویان بۆ دروست کردن و هەر یەکەش وێنەیێکی رەنگاو رەنگیان بۆ گرتن‌و دایانە دەستیانەوە ، عەبدولرەزا لە گەڵ خێزان‌و خوشکەکەیا بە هەمان دەستور چاو سورێ تێیان بەر بو وێنەیشیان بۆ کێشان پاشانیشی بیبەری رەشی کوتراویان تێکەڵ بە پەمپێ کردو پەمپیان‌داو لەبەر چاوی خوشك و خێزانەکەیا پەنما .. تەقی .. مرد ..

« شتێ بلێی تاوانباری .. هیچ نەلێی تاوانباری ، بێ تاوانیش بیت بە تاوانی بێ تاوانی لە ناوت دەبەن‌و سەرنگونت دەکەن ، هەر چیت بووە .. هەرچیت هەیە . لە خەون‌و هیواو خۆشەویستی بە دەم گازو چەقۆ و مەنگەنەو پانکە سەر دەبڕین ، پاشانیش روحت دەردێنن و هەندێ تۆپ تۆپێنی پێ دەکەن .... نازانم گەر روحی ئەزیەت کێش‌و ژانگرتووت لەو کاتەدا بەلەسەبێ وەکو دلۆپە جیوەیێك لە نێو لە پێ دەستیانە بە نێو پەنجەکانیانا هات‌وچو بکات‌و لە جێ‌یەکدا نەوەستێ‌و هەراسانیان بکات .. نازانم گەر روحت گەورە بێ رووبەروویان بوەستێتەوە وەکو تەوقی نەعلەت بلکێتە ملیانەوە ، یا لە نێو لۆچەکانی دەم‌و چاویاندا ئارام بگرێ ، شەوان لە نێو خێزان‌و منالەکانیاندا روبەرویان بووەستێ حەسانەوەو پێکەنینیان بشێوێنێ و ببێتە تارمایی رۆژی رۆشنیان‌و مۆتەکەی سەرسنگی ساتێ خەویان .. نازانم ..

گەر واش نەبێ ئەوا دەبیتە ژمارەیێك لە لاپەڕەی هەزارو ... لە ژێر زنجیرەی ژمارەیێکی وەك ئەم ژمارەیە زیاتر ١٩٧٩١٣ تۆقرە دەگری جەستەیشت گەر لە ژێر زەمینێکدا یا لە نێو دنگەی کونکریتی پردێکا ، یا لە نێو حەوزی ئەسید نەتوێننەوە ئەوا بێ‌شك لەزگی سەك‌و ورچ گورك‌و رێوی‌و دالەکانی باغچەی ئاژەڵدا . ئیتر لە نێو ریخۆلەکانیاندا دەبیتە ریتن ، زەوی‌و کرم‌و میشولە هەڵت دەمژێ ... » .

خۆ تەقم کرد ، دەبا سەر هەڵبرم ... ئاخر پێی ناوێ ... ئای .. ئەوە خۆ هەر دانیشتووە رەنگە تەنها کورسی یەکەی گۆڕی بێ ... ئەوەتا دیارە سەرنجە تینووەکانی خوێنی دەوێ .. خوێنی نێچیرێکی دەوێ .. بە هەر جۆر بێ .. دور نی‌یە دەنگە پەنکخواردووەکانی دەرونی وەکو زەنگی کلێسا ئارامیان لێهەڵگرتبێ‌و ناچاریان کردبێ .... دەیەوێ بە خوێن دەنگە

پەنکخواردووەکانی دەرونی دامرکێنێ .. ئای لەم بەستەزمانە گیرودەی چ خوێنێک بووە دەڵێی هیرونینیە ، دەیەوێ پاش خوێن مژینیشم بمکاتە دوکەڵو بەنگ بێ و دەرگای خەیاڵی بخاتە سەرپشت ... ئەرێ خۆ ناوێرێ تا بەنگ نەبێ لە ئاستی دەنگە خامۆشو پەنکخواردوەکانی دەرونیا خۆی راگرێ ... دەبێ مەست بێ .. بەنگ بێ .. بێ ئاگا بێ .. بێ هۆش بێ .. هەرچی ئەسپرینی دنیا هەیە رەنگە نەتوانێ – بۆ ئەم – کاری پەرداخێ خوێن ببینێ گەر سوکە سەر ئێشەیێک روی تێ بکات !! ..

بەستەزمانە .. چەند بێ خەتایە .. ئەو دەنگانەی دەرونی . بوونەتە منداڵ پەروەردەو ژیانیان لێ دەوێت ، دەبێ برسی نەبن وتێریان کات .. گیانی ئەم بەدبەختە بەستەزمانەش بە زیندوویەتی ئەوانەوە بەنە .. ئەم نێچیرەیش کوشتەی دەستی گەورە گەورەکانییەتی ، بێ گوناهە . برسی بو .. خوێنیان کرد بە خۆراک لە ئەمپولی مورفینو کۆکایندا لە باسکیاندا .. گیژ بو .. بەنگ بو .. ئیتر ڕاهاتە سەر ئەم جۆرە خۆراکو دەرزییە ... دور نییە لە پێشرا بۆ ئەوەی ڕابینن ئەم کارەیان لەگەڵدا کرد، بەزەییو سۆزیان کوشت .. بۆیە ئێستایش خوێن بووە بە دەرمانو تیماری ژانەکانی خۆی پێ دەکات .. ئەم تەنها نییە . بەشێکی تەواوی مەردوومەکانی سەر ئەم زەمینە راهێنراونەتە سەر ئەمدەرمانە .

**! ئای لە پیرۆزی ئەو کەسانەی لە پێناوی سەربەستی ئەم ئامێردانەدا تێدەکۆشنو خوبەخت دەکەن و رزگاری ئەمانەیان پەلاوە بووەتە بناغەی سەربەستی و سەربەرزی مرۆڤو مرۆڤایەتی ! .**

( ئێشی برسیو چەوساوەو دیلو سەرکوێر هەرگیز ناگاتە ئاستی ئێشو ژانی ئەم ئامێردانە.. ئەمانە لەدوو سەرەوە دووچاری ژانێکی سەرەتانی بوون . مردنیش چاریان ناکات . هەرگیزیش بۆ ساتێ ناتوانن چاوی ئارام لە یەک نێن ...

تێکۆشەرێ .. جەنگاوەرێ .. ئافرەتێ نەیەوێت ببێتە کوتاڵ . بەزەردەخەنەوە رو لە مردن دەکات و بەرەو پیری دەچێت کەچی ئەم ئامێردانە لە مردن دەترسنو سڵی لێدەکەنەوەو خۆیان دەشارنەوە . بەکوشتنی خەڵکی دی بەرگری لە مردنی خۆیان دەکەن ... ) .

ئەوەتا بانگی نیو چارەگی دیشی کرد ...

ئەوە کردییە پێکێک ، بە ئەڕی هەڵبدا ئەوە هێلنج دەدات .. رەنگە برژێتەوە .. ئای کە دەترسم برژێتەوە دەترسم ئەو خوێنانە برژێتەوە کە لە سەرەتای راهاتنی خوێن مژینیدا تا ئەمڕۆ مژیویەتی هەمووی بهێنێتەوە .. خۆ ئەم مەیخانەیە پڕ دەکات .. دەشێ تەنها رەنگی خوێنەکان گۆڕا بێو لە رەنگێکی دیدا .. بیهێنێتەوە .. لافاوی خوێن ئەم ناوە رائەڵێ .. ئەی هاوار لەو کاتەی کە خوێن دەگاتە بنا قاقام.. مەلەوانی دەزانم .. لەنێو خوێندا مەلەوانیم کردووە .. بێ دەربەستم .. نا ترسم گەر لەرۆژێکی وەك رۆژە شومەکەی هیروشیماو ئەبەسدا لە نێو خوێنی کوژراواندا مەلەوانی بکەم و ببمە فریاد رەسی ئەو برینداراناەی کە بە ئاستەم گیانیان تیادا ماوە .. بەڵام لەو خوێنە دەترسم رەنگە سورو ئاڵەکەی لە نێو گەدگی خوێنمژاندا گۆڕاوەو لەرێی هێلنجی هەڵپەی رقەوە دێتەوە .... چۆن دەتوانم مەلەوانی لەنێو ئەو خوێنەدا بکەم .. چۆن ؟!

دیارە نارژێتەوە .. پەیتا پەیتا مەزە دەئاخنێتە دەمییەوەو جگەرەکانی بەیەکدی پێ دەکات ... ئەوەتا گەرچی لێمەوە دورە لە نێو لۆچەکانی دەموچاویا ئەو هەموو دەنگو ئاڵەو نوزانە دەبیستم ..

ئەگەر تەمەنی ئاڵەو فریاد کێشانی مرۆڤایەتیو بەشخوراوەکان کۆ بکرێتەوە و لەیەك کاتدا بەرەڵلا بکرێن ئەوا تا یەك سەدە دەبێتە تاقە دەنگو دەنگی هیچ ئاپاڵمێك لە ئاستیدا نابیسترێ .. گەر ئەو دەنگانە بە جارێ بەر بدرێ ئەوا تا سەدەیێک هەرچی گۆرانیو ئاوازو چرپەو دەنگی باڵەندەکان هەیە هەموو لە نێو ئەو دەنگەدا دەبن بە سفر ... ئای دەبێتە چ دەنگێ ؟ .. چ کەسێ لەم سەردەمەدا دەتوانێ رو بە روی ئەو دەنگە خۆی راگرێ .. ؟ ئەگەر بکرێت ئەو فرمێسکانەی لە چاوی مرۆڤەوە هاتووەتە خوارێ کۆ بکرێتەوە ئەوا دەریایێکی بەرین لە فرمێسک لەسەر ئەم زەمینەدا جێ بۆ خۆی دەکاتەوەو زانایانی جوگرافیا ناچار دەکات ناوی دەریای فرمێسکی لێ‌نێن ... گەر بکرێ ئێسقان و کاسەی سەری ئادەمیزادە نێچیرەکان کۆ بکرێتەوە ئەوا چیایێکی بەرزتر لە هەمالایا لەسەر نەخشەی جیهاندا جێ بۆ خۆی دەکاتەوە ..

خۆ ئەوە ماڵ خرابە داوای نیو چارەگی تری کرد .. با خۆمی لێ بخلافێنم و سەیری ئەو

تابلۆ لە جام گیراوەی زۆر سەرم بکەم .. ئای ئای خۆ لە شوشەی تابلۆکەدا زیاتر خۆم دەبینم .. خۆ ئەوە چاوەکانی خۆم بە جوانی دەبینم ، ناشیرین نی‌یە .. خەوالووە ... شەرمنۆکە .. ئای لەو کاتەی کە لە هیچە دەستو پێم دەبەستنەوە بە هەندێ سەنگی ئاسنینەوەو گوریسێک دەنێنە ملمەوە ، پێش ئەوەی کورسیەکەی ژێر پێم بترازێنن بە ئامیری دەستی پزیشکێ هەر دوو چاوم دەردەکەن‌و تەئمیمی دەکەن !!

پێکەکەی هەڵدا .. باوەر ناکەم لێم‌دەن‌و دارکاریم بکەن‌و خۆیان ئەزیەت‌دەن خۆ گروپی خوینەکەم « ئۆ پۆزەتیف » چاکە .. کەمتر دەست دەکەوێ‌و بانقی خوێن زۆری پێویستە .. ئیتر بێ هۆشم دەکەن و هەمووی دەکێشنەوە ... هەر باوەڕیش ناکەم شەقێکیشم تێ هەڵدەن ئەوەك ئەندامە سەرەکی‌یەکانی جەستەم تێکشکێ .. گورچیلەم.. دلم .. سی‌یەکانم .. خۆ ئەمانە کەلکی ئەوەیان هەیە ئامێردێکی پەک کەوتە چاك کاتەوە ...

چاکە جارێ زۆر خێسەم لێ ناکات .. با هەر خەریکی ئەم نوسینەبم گەر لە دەستی دەرباز بوم ئەوا هێلە سەرەکی یەکانی هەڵدبژێرم ودەیکەمە پوختەی چیرۆکێ.. با هەندێ خۆمی لێ گێل بکەم .. گەرچی کاتیش درەنگە و زۆربەی زۆری مەستەکان ئێرەیان جێ‌هێشت .. نا .. تا درەنگتر بێ چاکترە.. ئێستا ئەو هەڵدەستێت.. ئەوا بۆیەکان کورسی‌و مێزەکان پاك دەکەنەوەو لەسەریەکیان دەنێن .. ئێستا دێن‌و دەڵێن (ببەخشی میخام در مەیخونە...) هەر دانیشتووە سەرنجی دوکەڵە خەستەکەی جگەرەکەی دەدات.. ئەوا خۆ بە تەواوی مەیخانەکە چۆڵ بو.. ئەوا هەر هەڵنەسا .. چی‌یە ؟ . چاکە هەر یەك دوو دێڕی تر دەنوسم و من هەڵدەستم .. **ئیتر چۆن زەفەرم پێ دێنێ ئەمەیان گرنگ نی‌یە ، لێرەنا .. لە شوێنێکی دی .. بۆ شوێنێک ماوە ئەم کوللانە نەیان کردبێتە وێرانەو گەرای خۆیان تیا نەخستبێتە چالەوە .. ؟؟**

ئای .. ئەوە دوو ئەفەندی پرچ درێژو گەنج هاتن .. چی‌یە ؟ . بەم شەوە درەنگە هانی خواردنەوەیان دەدات .. باوەر ناکەم بیەڵن دانیشن رەنگە سەفەری بکرن .. ئەوا یەکێکیان بۆ لای من هات ئەوی دیش بۆ لای ئامێردەکەی بەرانبەرم چو .. دوور نی‌یە بلێ بازارودوکان ئەماوە هەندێ جگەرەم بدەرێ ، با یەك دوو جگەرە لە پاکەتەکەم بۆ خۆم دەربێنم .. ئەوانی دیش با بۆ ئەو بێ ... ئەوا خۆ لە سەر سەرمدا وەستاوە .. **هیچ نالێ و چاوی بڕیوەتە نێو چاوانمەوە .. بە برۆ تێ‌ی گەیاندم .. هەڵسام کاغەزەکانی بەر دەستم پێچایەوە ویستم بینمە گیرفانمەوە لە دەستی سەندم ، لەگەڵیا رۆیشتم گەیشینە لای هاوڕێکەی .. ئەویش لە سەر مێزەکەی ئەو زەلامەی خێسەی لێ دەکردم‌و دوو سەعات زیاترە بەرانبەرم دانیشتووە .. وەستابو هەڵیسانبووە پاوە..منی لە تەنیشتی ئەوا راگرت بێ ئەوەی هیچ بلێن یەکێکیان کە لەبچەیێکی لە گیرفانیا دەرهێنا ، دەستی راستی من و دەستی چەپی زەلامەکەی بەرانبەر می گرت هەر دەستی‌یەکێکمان‌و لە نێو قەفی کەلەبچەکەدا جێ گیربو .. دەستی هەندێ گەرم بو .. سەیری یەکدیمان کرد ، بە بزەیێک هەر چی گومانی هەبو .. هەر چی‌گومانم هەبو بوو بە هەڵم‌و هەردووکمانی بە یەکەوە بەستەوەو بەزەردەخەنەیێکی رەنگاو رەنگ بوینە هاورێی دژوارترین رێ .**

**هەر دوو گەنجە قژ درێژەکە هەر هیچیان نەوت وەپێشیان کەوتین .. وردە وردە تاریکی شەقامەکان ..**

**هەر چوارمانی**

**هەڵدەلوشی**

**ئەیلولی ١٩٧٨**

●

**تێ‌بینی :**

١ ـ ئامێردەکان : دوو وشەی کوردی لێکدراوە
ئامیر : واتە آلة
مێرد : واتە پیاو
لە تێکەڵ کردنی هەردوو وشەکە ( ئامێرد ) دروست بووە .

٢ ـ لە مانگی نوێ هەفتاو نۆدا لە بارەگای یەکیەتی نووسەرانی ـ کورد لە بەغدا لە کۆڕێکا خوێنرایەوەو کاك حوسێن عارف ، هەڵیسەنگاند .

٢ ـ لە ١٩٨١/٢/١٠ لە کۆڕێکدا لە هۆلی فارابی لە شاری سولەیمانی‌دا خوێنراوەتەوە .

**هۆنەرە بەتواناکانی سەردەمانی دێرینمان ، تێکەڵ بە کزەی شەختە و یەخبەند و تین و شاڵاوی بەتینی دەروونیان ، تك تك خوێنی ئاڵو گەشی دڵی گوشراویان ئامێتەی هەستی ناسکیان کردووە و بەم چەشنە شەویان بە ڕۆژ و ، ڕۆژیان بە شەو لێ گۆڕاوە ، تا توانیویانە خۆشترین خۆراکی گیانیو مزترین شەوچەرەی هەرگیز نەبڕاوەمان بۆ بهێننە کایەوە و ، پشتا و پشت و تا هەتایە ئەم ڕیچکەیە نەبڕێتەوە و ڕۆژ بە ڕۆژ لە برەودا بێ ، بەم چەشنە کۆڕی هەمیشەیی گەرمە و هەست و سەرنجڕاکێشە ..**

بەڕاستی ئەبێ هەڵوێستی ئێمەش ئەو پەڕی ڕێز لێ گرتن و پاراستنو بڵاوکردنەوەی زادەی کرۆك و چرۆی خامە و هەست و بیری شۆڕە سوارەکانی مەیدانی ئەدەبی دێرینمان بێ ، تا بتوانین بڵێین پێشیاوین ئەم کەلەپوورە دانسقەیەمان پێ سپێرراوە ، ئەو کەلەپوورەی پشتا و پشت و بۆ سەدان ساڵانی شەوەزەنگی دوور و درێژ و ئێستاش بۆمباری زمانە باراوەکەمان و ڕۆشنبیری و بەڵگەی زیندووی ئەدەبی ڕەسەنمانە ...

بۆیە ناشێ و ناکرێ ڕەچەڵەك پێ شێل بکەین و سەرچاوە کوێر بکەینەوە و بڵێین شوێن پێی پتەوی خۆماڵیمان هیچ نی‌یە و هەموو هەنگاوێ زادەی سەرهەڵدانی ئێستامانە .... ئەگینا بە دەستی خۆمان بڕیار ئەدەین کە بۆ دوا ڕۆژ نەوەکانی داهاتوومان شوێنەوارەکانی ئەم ڕۆمان پشت گوێ بخەن و بە چاوێکی سووکەوە خێیان لێ بکەن و فەرمانی نارەوایان بسەپێنن و بڕیاری زیندە بەچاڵکردن و سووتاندنو لەناو بردنیان بدەن و لە عاستی ڕەوڕەوەی مێژووی ڕاستیدا ڕوو وەرچەرخێنن ؛ بێ گومان بە هێنانە بەرچاوی ئەم هەڵوێستە سامناکە ئەبێ دەم و دەست بڵێین « خوا نەخواستە » .

**مستەفا بەگی شاعیر و بلیمەت یەکێکە لە هەزاران دەربەدەر کە تا دواهەناسەی ، هەناسەی سارد لە سنگی نەبڕاوە ... وا لەم بوارەدا دوو هۆنراوەی ئەم شاعیرە بەتوانایە ، کە نازناوی هۆنراوەی « کوردی - هیجری » یە ، پێشکەش ئەکەم ، وەك ئاگاداریش بم تا ئێستا بە چاپ نەگەیشتوون ...**

هۆنراوەی یەکەم ، کە دەربارەی « چا »یە ، لە مامۆستا بەڕێز « مەلا عەلی سەنجەری » وەرم گرتووە ، ئەویش - وەك خۆی ئەڵێ - چل و دوو ساڵ زیاتر لەمەوبەر لەبەر دەسنووسی « مەلا عبدالصمدی ڕەزاو » لەبەری کردووە ... بە وتەی مامۆستا سەنجەری ئەم هۆنراوەیە ئەم بەسەرهاتەی هەیە :

لە سەردانێکی « کوردی » دا بۆ تاران ، لە ناوچەی لەیلاخی سنەدا ، لەگەڵ کاروانا لای داوەتە گوندی « باشماخ » ، بەو ئاواتەی لە ئاواییدا چایەك بخواتەوە و لە دەردی سەرئێشەی بێ چایی ڕزگاری بێ ... ئەوەش لە یاد نەکەین کە لەو سەردەمەشا چا زۆر دەگمەنو دانسقە بووە ....



که سەرنج ئەدا ، ئەبینێ وا دوو فەقێ لە هەیوانی مزگەوتی دێدا خەریکی کۆشش و دەور کردنەوەن ، ئەمیش لە دلی خۆیا ئەلێ : « فەقێ بێ چا هەل ناکات ... لە هیچ لایەك چا دەست نەکەوێ لای ئەم فەقێیانە هەر دەست ئەکەوێ ... » .

بەم چەشنە ئەبێ بە میوانی فەقێکان و داوای چا ئەکات ، ئەوانیش ئەلێن بە سەر چاو ... که کوردی ئەبینێ وا سەماوەر تێخرا و کەل‌و پەلی چا هێنرایە پێشەوە ، ئەوەندەی تر بێ ئارام ئەبێ و خەریك ئەبێ سەری بەربێتەوە .... لەم گێژاوی چاوەڕوانی‌یەدا ، لەبەر داوای پارچە کاغەزێك ئەکات‌و ئەم هۆنراوەیەی بۆ دێت‌و تۆماری ئەکات :

چا مرهەمی زەخمانە
دەرمانی برینانە
ئەجزایی طەبیبانە
خەمخواری حەزینانە

گەر مەیلت لەسەر چایە
تەعریفی لە لام وایە
شیرین ، پڕ ڕەنگ و مایە
نەزهەتدەری ڕۆحانە

شیرینە ئەگەر تالە
. . . . . . . . .
. . . . . . . . .
ڕۆحی هەموو ئینسانە[1]

بۆم تێ کە فەقێ سوور چا
لەعلی لەبی یار ئاسا[2]
زوو تێ کە لە بۆم دەی سا
ڕۆح هاتووە جەولانە

مەنظەرگەهت سەحرا بێ
چاوت کە لە لەیلا بێ
مەجلیس کە لەگەل چا بێ
دیوانی وەزیرانە

عەقل‌و هونەر و هۆشە
فەهم و بەصەر و گۆشە[3]
بێ ئەوی دل پڕ جۆشە
بێ ئەوی سەر حەیرانە

« هیجری » کە برینداره
ڕەنگ زەرد و خەفەتبارە
بێ چایی‌یە بێچارە
سینە و دلی بریانە ....

●

بێ گومان لەم هەلوێستەدا هەموومان لەگەلیاین و کەسمان لاری لەوە نی‌یە کە بەسەرچوون و تێپەڕبوونی کاتی هەلدانی پیالەی چا ئەبێتە مایەی سەرئێشەو بێ ئارامی ...

که هۆنراوەکە پیشانی فەقێکان ئەدات ، تێ ئەگەن میوانەکەیان زۆر پەرۆشی چایە و شیعرەکەشی لە بۆن و بەرامەی چایەکەیان بەچێژترە ... یەکێکیان ئەلێ : « شێوازی ئەم هۆنراوەیە لە هی مستەفا بەگی کوردی ئەچێ ... !! » ئەویش ئەلێ : « بەلێ ، من بۆ خۆم مستەفا بەگ باش ئەناسم ، کە نیشتەجێ بێ نازناوی هۆنراوەی کوردی‌یە ، کە لە گەڕان‌و سەفەرا بێ نازناوی هۆنراوەی هیجری‌یە ... ».

فەقێکانیش ئەلێن : « خۆزگە بە دیداری شاد ئەبووین ... » .

ئەویش ئەلێ : « ئەگەر زوو چایەکە دەم بکەن دەستتان ئەنێمە ناو دەستی ... » .

فەقێکان سەریان سڕ ئەمێنێ و ئەلێن « چۆن !! .. » .

ئەویش ئەلێ : « بەلێ ، مستەفا بەگ لەم گوندەدایە و من ئەزانم میوانی کێ‌یە ! ... » .

بەم چەشنە دەست و برد ئەکەن و یەك لە سەر یەك سێ ، چوار چای نایاب و ئاواتەخوازی چەسبی دەق‌و ناوەڕۆکی هۆنراوەکە لەبەر دەمی کوردیدا دائەنێن ....

که ئارەزووی چای ئەشکێ و چاوی ئەکرێتەوە ، بە فەقێکان ئەلێ : « جا فەرموون با دەستتان بخەمە ناو دەستی مستەفا بەگی کوردی » بەم جۆرە کە دەست ئەخاتە دەستی فەقێکان ئەلێ : « برا گیان هەر ئێستاکە دەستتان لە دەستی مستەفا بەگی کوردیدایە !! .. » .

* * *

شایانی باسە ، کە لە دەستنووسێکی کاك « احمد محمد - حەمکول » دا و لە لابەرە

ـ ٩ ـ دا ، هۆنراوەی ناوبراو بە ناوی « هیجری سنەیی » یەوە تۆمار کراوە .... ژمارەی دێڕەکانی هەردوو دەقەکە چوون یەکە .... بەڵام سەیر ئەوەیە کۆپلەی سێیەم لە هەردوو لا وەك یەکە و ناتەواوییەکەش چوون یەکە ... ئەم دیاردەیە ئەمانخاتە گومانی ئەوەوە ، کە ئەکرێ سەرچاوەی هەردوو هۆنراوەکە یەك بێ ، یا یەکێکیان لەوی تر وەرگیرابێ ... من وای بۆ ئەچم کە مامۆستا سەنجەری لەگەڵ بەرهەمی‌ترا ، هۆنراوەکەی دابێ بە مامۆستا « نەجمەدین مەلا »و کاك احمدیش لەبەر دەستنووسی مامۆستا نەجمەدین نووسیویەتیەوە ....

لە هەندێ شوێنا ، هەندێ جیاوازی لە میانەی هەردوو دەقەکەدا هەن ، لە پێشەوە ئەوانەی لە دەقی هۆنراوەکەی لای مامۆستا سەنجەری ، جا بەرانبەریشیان هێنەکانی دەقی دەستنووسەکە ئەنووسم ....

**( شیرین پڕ ڕەنگ و مایە )**<br>
**( شیرین و پڕ ڕەنگ مایە )**

**( بۆم تێ کە فەقێ سوور چا )**<br>
**( بۆم تێ کە دەسا سوور چا )**

**( مەنظەرگەهت سەحرایێ )**<br>
**( مەنزلگەهی سەحرایێ )**

**( بێ ئەوی دڵ پڕ جۆشە )**<br>
**( بێ وەی دلی پڕ جۆشە )**

**( بێ ئەوی سەر حەیرانە )**<br>
**بێ وەی سەری حەیرانە )**

* * *

هۆنراوەی دووەم ، دەووم هۆنراوەی دەستنووسێکی دێرینەی کاك « عەفان نەقشبەندی » یە ، کە ئێستا لامە ....

- پێوانەکەی بەم چەشنەیە : ( ٥ر١٧سم x ٤ر٩سم ) .
- بە خەتی نەستەعلیقی فارسی‌و بە شێوەیەکی زۆر جوان و ڕێك و پێك نووسراوەتەوە .
- لە هەر لاپەڕەیەکا ٨ هەشت دێڕ تۆمار کراون .
- ژمارە بۆ لاپەڕەکان دانەنراوە .
- پێڕستی هۆنراوەکان بە پێی ژمارەی هۆنراوەکان و زنجیرەی یەك لە دوای یەکیانە .
- لە هیچ شوێنێکا هیچ بەروارێك بەر چاو ناکەوێ .
- لە هەندێ شوێنا و بەینا و بەین هەندێ لاپەڕەی لا براون و نەماون ....

ئەمەش هۆنراوەکەیە :

**توو خوا ڕاستی بلێ دلبەر درەنگە**<br>
**ئەوە موژگانە قوربان ، یا خەدەنگە(٤)**<br>
**مەگەر خالق بە کەیفی خۆتی کردی**<br>
**کە عالەم بۆت بووە بە شێت و بەنگە**<br>
**لە حەسرەت ڕووی موویی کرژ و بڵاوت**<br>
**دڵم دایم میثالی غونچە تەنگە**<br>
**ئەوەندە تیری عەشقت دا لە جەرگم**<br>
**کە قافیەی شیعرەکانم بۆیە لەنگە**<br>
**لە حەسرەت چاوەکانت گێژ و وێژم**<br>
**کەچی خەلقی دەڵێن پێم مەستی بەنگە**

**وتم ، قوربان لەگەڵ دۆستی قەدیمت**<br>
**بکە صولحێ ، وتی ، خێر وەختی جەنگە**<br>
**وتم ، قوربان چییە مایل بە جەنگی**<br>
**وتی ، ماددەی سیاو وەش و پەشەنگە**<br>
**وتم ، قوربان بکە ڕەحمێ بە حالم**<br>
**وتی ، چ بکەم دلی من میثلی سەنگە(٥)**<br>
**ڕەفیق ئامان عیلاجی دەردی « کوردی »**<br>
**کە هیچ ڕەحمی نییە ئەو شۆخ و شەنگە**

●

**پەراوێز :**

**١ ـ مامۆستا سەنجەری ئەڵێ ، ئەم دوو تاکەم لە یاد نەماون .**

**٢ ـ لەب = لێو ... بە وێنەی لێوی ئالی یار بێ .**

**٣ ـ فەهم = تێگەیشتن . بەصەر = بینایی . گۆش = گوێ .**

**٤ ـ موژگان = برژانگ . خەدەنگ = تیر .**

**٥ ـ سەنگ = بەرد .**



خوا بۆی نووسیبوویت بەو ناسکیو شیرینی خۆتەوە ، خونچەی هیـوات پێشـێل بکرێتو دەست لەو تەمەنە ساوایەت هەلگرێت ! خۆتۆ کە لەدایك بوویت ، بۆ ئەوە نەهاتی‌یە سـەر رووی ئەو دونیا تاریکە ، تا ماوی هەر بە وونی گەریدە بێتو بەدووای دۆزینەوەی خۆتا بگەرێی !

کێ تۆی وون کردو ئاوێنەی ئـەو جوانیو بێ‌گەردی‌یەی لە ژێر قاچە سـتەمکارەکانی‌دا باوکت بشکێنی !

ئەو ڕۆژە تۆیـان هـەراج دەکردو پارەیـان لەسەر پشـتت دەژماردو ، دووایش وەپێش کۆچانی ڕیش سپی‌یەکان دەکـەوتی .. عادەت بوو ، شەرمەبوو ، ئابروو چوون بوو ، قسـەی باوکە بشکێن !

دەنگت نووسابوو ، لەنێو ئەو هەموو دەنگە چەورانە ، دەنگ هەڵبڕیو بەزمانی خواو یاسـاو ویژدانو مرۆڤایەتی ، پێیان بڵێی، خۆشەویستی کەرەستەیەك نی‌یە بکرێو بفرۆشرێ .

چەند بە زەلیلیو ناموویی کـەژاوەی بووکێنیتیان بەرێ کرد ، ئەوکاتە چۆن ئاسمان بارانی فرمێسکی نەباراند ! چۆن دلی زەوی نەقلیشا ! ئەو خەمـە گەورەی بەخۆیەوە هەلگرتبوو ، چۆن خۆر نەگیرا لە ئاست ئاگردانی دلتدا نەتۆقی !

پـەلیـان گرتیو فرێیان دایتـــە قوولایی بەندیخانـەی ژوورێکی تاریکتر لـە دلت ، لەوێ تۆیان ڕماند ...

تۆیان سووتاند ..

تۆیان خنکاند .

ئەو شـــەوە خەونی عومرت بوو ، چەندان سال بوو قژی خۆتت بۆ دادێنـا ، ڕازو سکالاو بناشتی دلدارانەت بۆ دادەنا ، ئـەو شەوە کپو خامۆشە تاقانەی مردنو ژیانت بوو ، کۆستـــتو حەسرەتی چەند ســـــالەی ، نهێنی دیوارو ژوانت بوو !

هەر ئەو شەوە خوێنیان لە گولمت هەلمژی، قژتیان وەکوو گولەگەنمی هاوین بری ، کەسـێ نەبوو ، فرمێسکی نامۆییت بسڕی ، دەســـت بەسەر دلتەوە بنێیو گوێ لـە خەمەکانت بگری ، چ گوناهێکت کردبوو ، کێت بەم دەردەوە بردبوو ، پەلیان گرتی ، دڕندەیەکیان لە گیانو جەســـتە ئالاندی ، سوخمەو کراسو دوگمانی ســـینگتو بەرۆکیان دڕاندی ، لەگرمەو بروســـکەی ئەو شەوە ، ئاسمان لە قیژەت ڕاچەنی ، زەوی لـە ئاهی هەناســـەت ، بەم دیوی خۆی دا ڕاژەنی . گەر دوێنێ شەو بوخچەی دوایت لە کۆلی خۆت هەلدابوایـە ، پەنجەکـانت تێکەل بـەپـەنجـەی کردایەو ... بڕۆیشتیایە ، لەم هەندەرو بنـارو دەشتو چیایە ، چەترێکت هەل بدابایە ، بەردت بکردایە سەرین ، دڕکو دالت بکردایـە ، نوین ، هەبوو بلێ ، مالی دونیاو کەسو کاری ، کـرد بەقوربانی دلداری !؟

ئەم خوێنە گەرمەو ئەشقە شـێتەت وازی نەهێنا ، ئاگری دلتو گڕی جەســـتەت تێکەل بوون ، ڕۆژیان لەو نیوەشەوە هەلێنا .

ئاگر چەند ئاشقی تۆ بوو !

بەکەمەرو جەستەی بەفرینتا ئالابوو ، وەکو ماری چەواشەیی خۆی لەگیانتەوە پێچابوو .. دامرکیوەو بەمشتێ خۆلەمێشی بەر ئاگردان ! خۆشەویستی زۆری وەك تۆی بوو بەقوربان .

# جوانەمەرگ بوو

نوسینی لۆزیل ئەلیسن : وەرگێڕانی لمیا عمر احمد

خرتەو فرتەی مشکی بنمیچەکە ـ لینی ـ یان بێدارکردەوە . باوێشکێکی داوخۆی لەسەرجێگە نەرمو گەرمەکەی کێشایەوە . سەری کردە سەرپشتی‌یە ساردەکە . سەرما پێستی شین هەڵ گەڕاندبوو . یەخەی ڕۆبەکەی کرابۆوە . قۆپچەکانی داخست . بەلآم هێشتا هەر سەرمای بوو . قاچی خستە ناولۆچی داوێنی ڕۆبەکەیەوەو لێ‌ی پاڵ کەوت . خرتەوفرتەی مشکەکان نەما . ( لینی ) لە دڵی خۆی دا ووتی :ـ [ مشکیش تاوێ ئەخەوێ ] .

چاوی بەژورەکەدا گێڕا . سەرنجی ئەو سوچە تاریکەی‌دا کەدوو خوشکەکەی لێ خەوتبوون . ( مارت )ی خوشکی هەنسکێکی هەڵکێشاو تلێکی‌دا . ( ڕۆبی ) جوولەی لێ نەئەهات . ( لینی ) حەزی ئەکرد مشکەکان بکەونەوە خرتەو فرتە . ماڵەکە هێندە خامۆش‌و تاریك بوو ؛ خورپەی ئەخستە دڵی مرۆڤەوە . بەڕۆیەکی لەملی‌یەوە پێچاو پاڵ کەوتەوە .

دەنگی سپرینگی چوار پاکەی دایك‌و باوکی لە ژورەکەی تەنیشتەوە ئەهات . [ هەموو کەس خەوتوون ؛ هەرمن بێدارم ] ؛ سەیرێکی خوشکەکانی کردەوە ؛ لە دووبارستە تاریکی ئەچوون لە ستیبەری پەردەی پەنجەرەکەدا . هەوا شێ دارەکە یەقی بەپێخەفەکەی کردبۆوە . ( مارت ) لەوەوبەر ئەیتوانی وەکو ئەم لەناو جێگەدا تل بدات . بەلآم لە حوزەیرانەوە کە توشی ئیفلیجی بووە ؛ بە ئاستەم ئەتوانێ بجولێ . ( لینی ) ئەوەی هاتەوە یاد کە چۆن دکتۆرەکەیان بانگ کرد بۆ ئێرە تا چاوی بە [ مارت ] بکەوێ . بەدەنگە وزەیی‌یەکەی بەدایکی ووت :ـ [ ئیفلیجی‌یەکەی سەخت نی‌یە ، بەلآم ئەبێ چەند ئەزمونێکی بەسەردا بکەم ] .

هەرسەیری ( لینی )یشی نەکرد . کەرۆیشت ماڵ ئاوایی لێ نەکرد . کەس هەستی بەو نەئەکرد کەلەوێ‌یە .

بێ‌گومان دایکی سەری قاڵ بوو . ( ڕۆبی ) کەدوو ساڵ لەم گەورەتر بوو یاریدەی دایکی ئەدا بۆ ڕاپەڕاندنی ئیش‌و کاری ناوماڵ . هەموو شەوێ کە باوکی لەجەنگەڵەکە ئەهاتەوە ، بێ‌ئەوەی ئەم بدوێنێ ، یەکسەر ئەچوو ( مارت ) ببینێ . دوای نانی شێوانیش خەریکی ئەو ڕاپۆرتاجانە بوو کە ئەم ئەیزانی باوکی ئەیخاتە ناو ئەو سندوقەوە لێ‌ی نوسراوە [ مەڵبەندی سەرەکی کاروباری زەوی ] . حەزی ئەکرد باوکی هێندە خۆی ماندوو نەکردایەو ( ڕۆبی ) وا بەگورج‌و گۆڵی کاری نەکردایەو دایکی ڕێ‌ی بدایە ( مارت ) ببینێ . ئێستا ( مارت ) باشترە ، بەلآم هێشتا زۆر نازی ئەکێشن . ( لینی ) بەبیری‌دا نایە هەرگیز ئەمیان ئەوەندە خۆش‌ویستبێ . هیچ شتێکی وای بەسەردا نەهاتووە ، تا بۆی بەداخەوە بن‌و نازی بکێشن . لەپڕ ، لەجێگەکەی‌دا ڕاست بۆوە ، ووتی [ ئەوا ئەمرم ] .

سەرماکە هێنابوویە هەڵ لەرزین . هەستایە سەرپێ ، دانەتەقێ‌ی پێ‌کەوتبوو ، دووجار لەژێر لێوەوە ووتی [ مردن لە ئیفلیجی گرنگ ترە ، ئەوا بەئازایی ئەمرم ] ، پاڵ کەوتەوە . ئەوەی هاتە بەرچاو ؛ خەڵکی لە شین‌و ماتەمەکەی‌دا کۆ ئەبنەوە ، ئەگرین‌و ئەڵێن :ـ [ تازە تەمەنی بوو بووە دەساڵ‌و نیو ، دەستی شکاوم جوانەمەرگ بوو ] . خۆی وەکو کیژێکی جوانکەلە هاتە بەرچاو ، کەچۆن لەناو داری مردووێك‌دا درێژبووە لەمەڕمەڕو ئاوریشم‌و دانتێل دروست کراوە . زەردەخەنەیەکی شیرین‌و بەجەرگی بەسەر لێوەوەیە . دەم‌و چاوە سپی‌و قژە هەنگوینی‌یەکەی هاتە بەرچاو . دایکی دێتە پێشەوە ، سەیری زەردەخەنەی کچەکەی ئەکاو ئەڵێ [ زۆر بەئازایی مرد ] . باوکی دەستەسڕێکی ووشك ئەدات بەدایکی . ( لینی ) لە دڵی خۆی دا ووتی : [ واباشترە ڕاسپاردەیەکیان بۆ بنوسم ، باڵە جیاتی گوڵ ، ئەلبومی ئەسپ‌و کتێبەکانم بخەنە باوەشەوە ] .

هەوڵی‌دا خۆی گەرم بکاتەوە . فرمێسکێك بەڕووی دا خلۆر بۆوە . بەلآم نەئەگریا ، دەم‌و چاوی ئەیەشا . کەسپێدەی‌دا . هێشتا ماڵەکە زۆر تاریك بوو . سەرنجی ئەو سێبەرانەی ئەدا کە سوچ‌و قەراغی دیوارو سەربانەکەیان دروستیان

کردبوو . ڕەنگی ماڵەکەیان خۆڵەمێشی بوو . ئەم ڕەنگەی بەدڵ بوو . چونکە لەڕۆژدا وای لەسەرچەفە سوورو زەردەکەی ئەکرد زیاتر لەبەر چاوبن . ئەو چەپکە | لۆپین‌و جیرانیۆم |ە ئیزیلەیەی دوێنێ لە گوڵدانەکەدا دانرابوون . ئێستا سیس‌بوون‌و سەریان بەلای پەردەی کاڵی پەنجەرەکەدا خوار کردۆتەوە . حەزی ئەکرد | مارت | بێداربێتەوەو کەمێ پێکەوە قسەبکەن . لەوانەیە مشکەکانیش بزانن ئەم خەریکی مردنە . بۆیە وابێ‌خرتەو فرتەن . کەس لەکاتی مردنی مرۆڤدا یاری ناکات .

هاتە خوارەوە ، لەژێر جێگەکەی‌دا بەدوای پاپوچە زەردو سورەکانی‌دا گەڕا ، تەڕ بووبوون ، لەتەختەی زەوی ژورەکە ساردتر بوون .

خۆی بەرزکردەوە ، سەرپۆشەکەی لەسەر قەرەوێلەکەی هەڵگرت‌و بەرەو دوو قەرەوێلەکەڕۆیشت . خۆی بەسەر | مارت |دا چەماندەوە تابێداری بکاتەوە ، دانیشت‌و باڵی دا بە دیوارەکەوە . دەستی هێنا بەدەم‌و چاوی ( مارت )دا ، چاوە قاوەیی‌یەکانی کردەوە ، نوقاندی‌یەوە . ( لینی ) بەچرپە .

**ووتی – [ مارت ، ئەوا من ئەمرم ] .**

**مارت – بەسرپە وەڵامی دایەوە – [ لینی – هەموو کەس ئەمرێ ، بچۆرەوە سەر جێگەکەی خۆت ] .**

**— [ نەخێر ناچم ] .**

**— [ بێدەنگ بە ، [ ڕۆبی ] هەڵئەسێنی ] .**

**— [ گوێ بگرە ، ( ڕۆبی ) دەستی شکا ، باوکم دانێکی لای ئەو دانسازە سەرخۆشە دەرهێنا ، دایکم بەمنالی توشی هەوکردنی سی‌بووە ، تۆش کە سالی لەمن منالتری توشی ئیفلیجی بووی ] .**

پرچی لای ڕاستی توند ڕاکێشا ، سەرمای بوو ، خۆی خزانە پاڵ ( مارت ) تا گەرم بێتەوە .

**— [ هێشتا هیچی خراپ بەسەر مندا نەهاتووە ] .**

چاوەکانی پڕ بوو لە فرمێسك ..

**— [ سەیرکە ، خوا منی بۆ شتێکی زۆر خراپ هەڵکرتووە . چ شتێ لە مردن خراپترە ! ] .**

( مارت ) چاوی دابچراند :

**— [ ڕاست ئەکەی ، من بیرم لەمە نەکردبۆوە ] .**

دەنگی نزم کردەوە :

**— [ لین ، بەتەمای کەی بمری ؟ ] .**

چاوی بەکراسەکەی سڕی :

**— [ لەوانەیە ئەمڕۆ ، لەوانەیە ئێستا ] .**

**— [ باشە ، کەواتە بابخەوینەوە ، ناتوانین نەهێڵین بمری ] .**

**مارت – پاڵ کەوتەوە ، باوەشی کرد بە ( لینی ) دا .**

**— [ هەر ئێستا دێمەوە ] .**

لە جێگەکە دەرپەڕی‌یە دەرەوە ، لەسەر نوکی پەنجە بەرەو دەرگا تەختە خۆڵەمێشی‌یەکە ڕۆیشت ، کردیەوە . بەقادرمە چیمەنتۆکاندا چووە خوارەوە .

خۆر هەڵنەهاتبوو . سەرپۆشەکەی لەخۆی‌کردەوە . پرچەکانی بەربوونەوە . بەرێگاکەدا بەرەو سەرئاوەکە چوو . خڕکە بەردی بچوك‌و پارچەی ڕەقی کولێرە چەورەی کە دایکی کردبووی بەسەر ڕێگاکەدا بلاوبووبوونەوە .

مشتێ کشمیشی هەڵخراوی هەڵگرت ، دەستی کرد بەخواردنی ، چەند شیرین‌و فرە ناوك بوو . بۆ یەکەم جار سەیری خوارەوەی چیاکەی کرد . دۆڵەکە بەتەمی سپی‌و بۆر داپۆشرابوو . حەند شلکە گیایەکی سپی‌و پەمەیی سەریان لە زەوی‌یەکە دەرهێنابوو . ( لینی ) چوون بۆ سەرئاوەکەی لە بیر نەما . سێ پلەی پەیژە دارینەکە سەرکەوت ، سەرپۆشەکەی هەڵدایە سەر یەکێ لە پلەکان‌و دابەزی . بەناو گژوگیا ئاونگ دارەکەدا تا ناوەڕاستی مەزراکە ڕای‌کرد . کەمێ وەستا ، مردنی لەبیر نەما . باڵی بلاوکردەوە ، بەوپەڕی توانایەوە بەدەوری خۆی‌دا خولایەوە . تاکو ڕۆبەکەی تا سەر ئەژنۆی تەڕبوو . لەقۆڵ‌و قاچی ئالا . دەستی کرد بەپێکەنین ، پرچەکانی خست بەپشتی‌دا . لەسەرخۆ هەولی گرتنی تەمەکەی دەوروبەری‌دا . لەدلی خۆی‌دا ووتی :

**[ هەرگیز هەولی گرتنی تەمم نەداوە ] . لە پێکەنین کەوت [ ئەمە دوا جارمەو ئیتر ناگەم تەم بگرم ] .**

وەرچەرخا ، بەرەو ڕێگاکە گەڕایەوە [ زۆر سارده ] . بەرەو پەیژەکە چوو ، سەرپۆشەکەی

لە خۆیەوە پێچا . لەسەر دوا پلەی دانیشت . سەرنجی تەمو تەختایی [ فیلادلفیا ای ئەدا – [ لەوانەیە ئاسمانیش وابێ ] .

ڕۆبە تەڕەکەی لەلاقەکانی دوورخستەوە . تەڕایی‌یەکە گوڵە بەنەوشەی سەر ڕۆبەکەی مۆر هەڵگەڕاندبوو . بەدەنگی بەرز ووتی :

**— [ لەوانەیە ئێستا من لە ئاسمان بم‌و بەخۆم نەزانم ] .**

خۆی گرمۆڵە کرد . سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد .

**— [ کە هاوینان دێین بۆ ئێرە ، دایکم پێرە ئەڵێ ئاسمان . بەڵام ئاسمان نی‌یە ، ئاسمان کەی مێرووی لێیە ؟**

هەستایە سەرپێ . کەمتر هەستی بەسەرما ئەکرد . لەلای پێی پەیژەکەدا . گوڵە بەهارەیەکی زەردی بچوك خۆی بۆژوانی خۆر قیت کردبۆوە . ( لینی ) لێی ورد بۆوە تاکو پەڕە بچکۆلەکانی سەریان کرد بەیەکداو قوچەکێکی نەرمی بچوکیان پێك هێنا . لەدڵی خۆیدا ووتی – [ ئەوا مرد . تەنیایەك شەو ئەژی . وامرد ] . پرچەکانی هەڵدایە پشتی‌و بەخەمناکی‌یەوە سەری پرچی خستە ناودەمی . تامی سرکەو شامپۆی [ ودبەری ] ئەدا . شنە بایەك هەڵی کرد . شلکە گیاکانی شانەوە . بەرەو ماڵە بۆرە سەوزباوەکە چوو . هەستایە سەرپێ . سەرپۆشەکەی لە خۆی ئاڵاند . چووە ناو مەزراکە . دەستی ڕاستی بەرەو لای تەمەکان ڕاکێشا کە کەوتبوونە جوڵە . ووتی : [ من کابانی ماڵم . بەنازایی‌یەوە بەرەو ڕووی مەرگی ڕەزا تاڵ ئەبمەوە ] . فرمێسك زایە چاوەکانی . [ کابانیش ئەگرین ] . بە پەیژەکەدا سەرکەوت . ملی ڕێگاکەی گرت . هەندێکی تر کشمیشی هەڵگرت [ لەوانەیە ئەگەم جارێکی تر کشمیش بخۆم ] . بەپردەکەدا پەڕی‌یەوە . خۆی کرد بەماڵەکەدا . ڕۆبە تەڕەکەی داکەند . بەسەر قەرەوێڵەکاندا هەڵی خست . پاپۆچە سورەکانی داکەند . بەسەر [ مارت ] چەمایەوە . خۆی خزانە پاڵی‌یەوەو لەجێگە گەرمەکەدا مت بوو .

نزیکی چێشتەناو . دایکی لەبەردەم ماڵەکەیاندا . لەسەر پارچە تەختەیەك دانابوو . قژی بۆ ڕێك ئەخست .

( تیم مۆرتینن ای بەسالاچوو بەسواری ماینە سورەکەی کە ناوی ( راحل ) بوو . هات بۆ لایان . ئەیویست لە تەلەفونەکەی [ ئاروباری جەنگەڵەکان ]ەوە تەلەفون بکات . کە لەناو سندوقێکی ئاسندا بەلای دەرگای ئەماندا هەڵواسرابوو .

قژی – لینی – هێندە شانە کردبوو ، تاڵەکانی وەکو ئاوریشم بەسەرشان‌و دەم‌و چاویدا پەخشابوون . کە خۆرەکە لێی ئەدا وەکو چەپکێ تاڵی مس ئەیبریسکاندەوە . ( لینی ) بیری لەوە ئەکردەوە ؛ تۆ بڵێی وەك [ ئینجیل ] ئەڵێ ، لەبەهەشتدا ئەبێ سەرپۆش بدەن بەسەرداو ئەم قژە بشارنەوە . گەر وابێ ئەوا بەرەو دۆزەخ دائەبەزێ تابزانێ لەوێ چۆنە .

تیشکی خۆرەکە ، تەوقەسەرە – زیوین‌و مووی سەرقەپۆزی ماینەکەو ڕیشە درێژەکەی

[ تیم ]ی ئەبریسکاندەوە . دەسکی تەلەفونەکەی هەڵگرت . سێ زرەی کورت‌و دوو زرەی درێژی لێ هەڵساندو دەستی کرد بەهاوار کردن . کە تەلەفونەکەی دانایەوەو دەرگای سندوقەکەی داخستەوە . [ دایکی لینی ] داوای لێکرد بچێتە ماڵەوەو کەمێ کولێرە چەورەیان لەگەڵ بخوات . ( تیم ) کابرایەکی زۆر عەنتیکە بوو ، قاوەی بەگەرمی نەئەخواردەوە .

سەیرێکی ( لینی ) کرد ووتی :- [ بەرخەکانم ، حەز ئەکەن سواری – ڕاچل – بن ] .

مارت – لەدەرگای چێشتخانەکەوە هاواری کرد – [ بێ‌گومان زۆر حەز ئەکەین ] .

( لینی ) لەگەڵیاندا سوار نەبوو ، لەترسی ئەوەی نەوەك بکەوێتە خوارەوەو بمرێ . لای ( ڕۆبین ) دانیشت ، کە باشترین سەگی شوانی [ تیم ] بوو .

لەسەر کلکی ماینەکەوە سەیری بریسکانەوەی هەورەکانی ئەکرد . سەیری خۆری نەئەکرد کە ئەتووت لەسەر تەختێکی زێڕین ئەگرێ . هیچی نەئەدی ئەو دوو هەڵۆ کلك سورە نەبێ ، کە پێکەوە بەئاسماندا خولیان ئەخوارد .

پاش نیوەڕۆ دایکی‌و ( مارت‌و ڕۆبی ) لە چیاکە دابەزین بۆ ناو شار ( لینی ) لە ماڵەوە مایەوە ، لەترسی ئەوەی نەك لە ماشینەکەدا شتێکی لێ‌بێ ، بەتایبەتی کە ڕێگاکە تەسك‌و پێچاو پێچە .

ویستی ماڵئاوایی لە مشکەکان بکات . کە

-ـــینەکە ڕۆژی ، گیـا درێژەکانی پاڵ دیواری
-ـەکەیانی لاداو خۆی کرد بەژێر گوێسوانەکەدا .
-جربە ووتی :

— [ مشکەکان ماڵئاوا ] .

هیچی نەدی بجولێتەوە ، کەمێ وەسـتا .
ـــکەکان گوێ بەماڵئاوایی ئەم نادەن ، لایـان
-رنگ نی‌یە گەر بشمرێ .

کە دایکی‌و کچەکان لەشـــــار گەڕانەوە ،
-وکیلێ لەگەڵ خۆیان هێنابووەوە . ( ڕۆبی ) لای
-ستی باوکی‌یەوە سوار بووبوو . حەزی ئەکرد ،
-ەگەڵیاندا بڕۆشتایە ، تا لەپاڵ باوکی‌یا سـوار
-وایە. پاش نانخواردنی شێوان باوکی گیتارەکەی
هێنا . لەدەوری ئاگردانەکە کۆبوونەوە گۆرانیـان
-ەووت. ( لینی ) ئەمەی بەدڵ بوو ، کەیاری ئەکرد
-لی دابوو بەلاقی باوکی‌یەوە . سەرنجی پریشکی
ئاگرەکەی ئەدا کەچۆن بەرز ئەبنەوە کە ئەگەنـە
-ریکایی‌یەکە ، کەمێ ئەگەشێنەوەو دائەمرکێننەوە
سەرنجی دایکی ئەدا کە گۆرانی ئەووت .

ئاگرەکە دەم‌و چاوی ڕوناك کردبۆوە ، قژی
ئەبریسکایەوە . سەرنجی ئەو خەڵوزانەی ئەدا لە
دەوری ئـاگـرەکـــە دانـرابـوون . کۆڕیــان
گەرم‌و شەوەکەیان خۆش بوو ، ئەســـتێرەکان
گەش‌و زلتر لە شـــــەوان ئەهاتنە بەر چاوی .
پشتی کردە ئاگرەکە . کـــە کزەبایـەك لەڕوویدا
تەزوویەکی بەلەشدا هێنا ، دوو درەختی بـەرز
بەچرپە یەکیان ئەدواند . بۆنی گژوگیاو سـەلکە
کاژ لە ئاگرەکەوە ئەهات .

( مـارت ) کـــە گۆرانی ئەووت ، چـاوی
ئەبریسکایەوە . ( لینی ) نەیئەزانی چاوی ئەمیش
ئەبریسکێتەوە . لەوانەیە لەبەر ئەمەبێ باوکی وا
( مارت )ی خۆش ئەوێ . باوکی حەزی لەگۆرانی
[ مەکسیکی ] بوو ، دەستی کرد بەووتنی گۆرانی
[ ئێـل کـۆیلیلی ] . کـــە ( لینی ) زۆر حـەزی
لێ‌ی بوو :-

بابە ؛ هەڵۆ سپی‌یەکە مرد
ئەیی‌یی ، یی‌یی .
لە کاژێری سێ‌ی بەیانی‌دا مرد
بەچکەی هەڵۆ سپی‌یەکە
ئەیی‌یی ، یی‌یی
بۆ ئەم کۆستەیان ئەگریان .

چاوی پڕ بوو لە فرمێسك . لوتی ســـــور
هەڵگـەڕا . هـەموو کەس باسی مردن نـەکـا .
هەستایە سەر پێ ، دایکی ماچ کردو شـــەوباشی
لێ کرد . پاشان باوکی ماچ کرد . گیتارەکەی دانا ،
توند لە ئامێزی گرت ، لوتـە خۆر بردووەکـــەی
ماچ کرد . ( لینی ) لەوە ئەترســـا بگری ، ووتی
[ بابە شەوباش ] .

ئیتر چوو بۆ ژوری خەوتن ، لـە تاریکی‌دا
جلەکانی داکەندو ڕۆبەکەی لەبەرکرد . هێشـــتا
هەستی بەشوێن ڕیشی باوکی ئەکرد لەســـــەر
کولمی . ( مارت ) بەئەسپایی دەرگاکەی کردەوە ؛
هاتە ژورەوە ، ( ڕۆبی ) بەدوای‌دا هات . بەچرپە
پێ‌ی ووت :- [ باسی مردنەکەتم بۆ دایکم کرد ] .

ڕۆبی - بەسرپە ووتی :

— [ مردن باشترین شتە گەر توشت بێ ] .

مارت - قسەکەی پێ بری :

— [ ئەمە قسەی - مەسیح - ە ] .

ڕۆبی - قسەکەی تەواو کرد :

— [ باشترین شت مردنە. تۆ هێشتا منالی‌و توشی هیچی خراپ نەبووی . خوا هێنـــدە تۆی خۆش ئەوێ ، ئەتباتەوە بۆ لای خۆی ، ئەیەوێ لە نزیکی‌یەوە بژی ] .

هەژدە هەژدە قســـەی ئەکـرد ، ( لینی )
نەیئەتوانی قسەکەی پێ ببڕێ ، تا بۆ هەناسەدان
وەستا . ( لینی ) پرچی خۆی توند گرت ووتی :

— [ کەهاتن بۆ ماڵی ئەو ، جارجارە سەرم لێبدەن ] .

مارت - ووتی - [ زۆر باشە فێلباز ] .

سەری پرچی نایە ناودەمی ، تامی سرکـەو
شـــامپۆی ( ودبەری ) ئەدا . لەپڕ دایە قاقای
پێکەنین . ڕۆبی‌و مـارت - یش‌دایانـە قـاقـای
پێکەنین‌و چوون بۆ ناو جێگاکانیان بخەون . کـــە
( لینی ) بەتەواوی خـەوی لێ‌کـەوت ، خوتـەو
فرتەی مشکەکان بێداریان کردەوە . لە جێگاکەی‌دا
قیت بووەوەو بزەیەکی گرت . مشکەکان بەردەوام
بوون لەسەر خرتەو فرتەی خۆیان .

---

* لەم کتێبەی خوارەوە کراوە بەکوردی :

Short Story Writing

by : Wilson R. Thornley

A Banton Book 1979

page : 81 — 97

# قولینگان

نووسینی : یشار کمال
گۆڕینی لە تورکی یەوە احمد محمد اسماعیل

هەر ئەو رۆیشتنەی بوو ، وا نۆ ساڵە .. نۆساڵ نەرەنگی هەیە نە دەنگ !

گولبەهار بەدرێژایی ئەم نۆساڵە ، رۆژێ بێزاری دەرنەبڕی ، ختوورەی خراپی بەدڵدا گوزەر نەکرد . هەموو ئانو سەعاتێکی ئەو نۆ ساڵە لە چاوەڕوانی نەکەوت .

دونیا لەسەرخۆ ، هێدی هێدی رووناك دەبوو ، تەمێکی خاو لەزەوییەوە بەرز دەبوەوە . گولبەهار کاتێ گەیشتە نێو کێڵگەکە هێشتا شەوی مابوو ، لەبەر تاریکایی ، گیای لە بنجە پەموەکان بۆ لەیەك جیانەدەکرایەوە .. زۆر نابا رۆژ هەڵدێ . ئاسۆ رەنگی ئەرخەوان دەگرێتەخۆ ، تیشك دەشتو دەردەگرێتەوە ، زەوی داخ دەبێ ، وا داخ دەبێ ناتوانی پێ‌بنێیتە سەری ، هەناسە سوار دەکات ، دونیا دەبێتە فرنێکی داخراو . لەسەر ئەمەشەوە بەپەرۆشەوە چاوەڕێی هەڵهاتنی رۆژ بوو . کەمێ نوشتایەوەو قورسایی لەشی خستە سەر تەورەکەی دەستی . بیری دەکردەوە . ئا لەم کاتەدا چەپکە تیشك پەلە هەورەکانی سەر چیای « گاورداغی » ئاڵ هەڵگەڕاند لەو رۆژەوە « مِحمود » رۆیشتووە تاکو ئەمرۆ نۆساڵی رەبەقە .

« محمود » تابڵێی پیاوێکی دامەزراوو لەبارە ، کەڵەگەت ، لێو ئەستور ، دووچاوی رەشی پێوەیە . بەگەواهی هەموو دانشتوانی دێ : دێ پیاوێکی وای بەخۆیەوە نەدیوە ، یوسفی زلیخا بوو بۆخۆی . دارایی دونیای « محمود » لە کێڵگەیەکی پێنج دۆنمی بەولاوە هیچی کەی شك نەدەبرد ، کە بەهیچ جۆرێ مایەی گوزەران نەبوو . هەر دووەم مانگی گواستنەوەی « گولبەهار » بوو بەدوای ناندا سەری غەریبی هەڵگرتو ئامانەتی پارچە زەوییە چکولانەکەی بە « گولبەهار » سپارد :

— ئەم کێڵگەیە بچێنە تادێمەوە .

قەتاری قولینگان پۆل پۆل تێ‌دەپەڕن ، بەڕیز ، پۆل پۆل لەشێوەی داسێکی گەورە بە ئاسمانەوەو بەژێر پەڵە هەورە ئاڵەکانەوە تێدەپەڕین ، بەرز دەفڕین .. بیری « گولبەهاریش » لە گەڵیانا بەرز دەفڕی ...

گولبەهار خۆی گولبەهارە . گەلێ لاوی لێ‌هاتووی دێکەی خۆیانو دێکەی ئەولایان کاتی خۆی خوازبێنیان کردبوو . ئەم لەناو هەموویاندا « محمود »ی بەدڵ بوو ، هەر بۆ « محمود » یش بوو ... ئێستاش هەر شۆخەکەی نۆ ساڵ پێش ئێستایە .. مەمکە تونەکانی ، ناو قەدی باریکی ، قژی تاکەمەر هاتووی پڕ لە ئارەزوو ، لێوە ئاڵو پڕەکانی ، چاوی مەستی پڕ لەنازی ئێستەش دڵان حەیران دەکەن . کەچی نۆ ساڵە دەستی پیاوێکی لێ نەکەوتووە . هەندێ جار کە چاوی بەلاوانی دێ دەکەوت ختۆکەیەکی خۆش بەدڵیا گوزەری دەکرد ، بەڵام گورج بەخۆیا دەهاتەوە لەختۆکەکە زیاتر زیادە رۆی نەدەکرد ، بەوەشەوە نە دەوەستا دەکەوتە سەرزەنشت کردنی خۆی ، بەنەنگی‌یەکی گەورەی دەزانیو بەرامبەر «محمود» دەیکات .. زوریش هەبوون کە « گولبەهاری » دەدیت : ئاهێکی پڕ لەحەزی هەڵدەکێشا . دوای رۆیشتنەکەی «محمود» کارێکی نەکردەنیبان بە « گولبەهار » کرد .. شەو درەنگ دەرگاکەی کردبوەوەو خۆی کوتابوە جێگاکەیەوە ویستبووی بەزۆرەملێ توخنی بکەوێ . گولبەهار کە غیرەتو گورجی‌ی پیاوێکی هەیە ، دوای دەست وەشاندنێکی باش دەری کردبوە دەرەوە... لەبەر ئەمە شەوانی لێ دەبوو بە دۆزەخ ، هەندێ



شەوانیش تا بەیانی خەو لەچاوی نەدەکەوت . وەکو ئافرەتێکیش شەوان لەشی دەبوە پارچەیەك ئارەزوو ، بۆ میهرەبانی پیاوێك وەختەبو گڕ بستێنێ بەڵام ئابڕووی لەلا هەموو شتێكبوو .

زۆربەی شەوانیش بەچاوی خەیاڵ « محمود » بەسەری دەکردەوەو دەگەڕایەوە لەدێ کەدا گەلێ بەندو بالۆرەیان بۆ « محمود » هەڵبەستبوو ، ئەو ماوە درێژەشی پێچووبوو ئەوەندەی تر خوێو ترشیان پێوە دەکرد ، لەو حیکایەتە سەمەرانە :

لە یەکێ لەشارە گەورەکاندا بوەتە زاوای کابرایەکی خانەدان . خاوەن جووتێ ئۆتۆمبیلو کۆشکێکی دوو نهۆمە ... باسێکی دیکەشی رەواجی هەبوو گوایە : خودان کارگەیەکی دەسترۆ تەنیا کچێکی دەبێ ، شوفیریان بۆ دەکات ، هێنانو بردنی کچەی پێ دەسپێرێ ، ئجە حەزی لێدەکات ، زۆر نابات کابرای و جاخ کوێر دەمرێ « محمود »یش خێری دونیا رووی لێدەکاتو دەکەوێتە سەر ئەو حاڵو ماڵە .

« دورمشی » خەڵکی گوند گوایە رۆژێکیان لەشارێکدا « محمود » بەدی دەکات . خیرا بەردەم ئۆتۆمبیلەکەی پێ دەگرێ . لەناو ئۆتۆمبیلێکی رەشی گەورەدا پاڵی لێدابووەوە « دورمش » دەیگێڕایەوە هەر لە قایمەقام دەچوو ..

— **« چیت دەوێ بۆ ڕێگەگەمت لێ گرتووم کابرا » .**

« محمود » بەفیزێکەوە وای پێ ووتبوو .

« دورمش » دەمی بەیەکدا هاتبوو بەهەزار حاڵ ووتبووی :

— **ئای نامناسیتەوە ، تۆ محمودەکەی خۆمان نیت .**

« محمود » زاق زاق تەماشای کردبوو بێئەوەی هیچی تری پێ بڵێ بە شۆفێرەکەی ووتبوو :

« لێخوڕە کورە » .. « دورمش » خۆی لانەدابایە پێچی ئۆتۆمبیلە درێژەکەی ونجڕ ونجڕی دەکرد .

« گوڵبەهار » باوەڕی بەمانە نەدەهات « ئەو بۆ کاسبیو نان پەیدا کردن سەری غەریبی نابێتەوە هیچی کەی بەلاوە مەبەست نییەو ئەم جۆرە شتانەی بەخەیاڵدا نایەت » .

هەموو جارێك ئەمەی بۆ خۆی دەوتەوەو هەوڵی دەدا بڕوا بە ووتەکانی خۆی بهێنێ .. لەلایەکی تریشەوە سەری لەم کەینو بەینە دەرنەدەچوو .

رۆژ واخەریکە هەڵدێ ، تروپکی شاخەکان ، یالە بەرزەکان رووناك بوونەتەوە .. خاکە گەرمەکە ، دەغلە زەرد هەڵگەڕاوەکان ، پارچە پەمووەکەی تەنشتی ، گوڵە بەرۆژەکان کەبەنازەوە ملیان شۆڕکردبوو بۆ خاکەکەو بەئاستەم خۆیان دەلەقاندەوە تەمێکی خاو وەك تارایەکی تەنك هەموویانی پۆشیبوو بەکاوەخو شەپۆلی دەداو بەرز دەبوەوە .. لەلایەکەوە بەپەرۆشەوە چاوەڕێی هەڵهاتنی رۆژ بوو ، لەلایەکی کەشەوە لە هەڵهاتنی

دەترسا .

« گولبەهار » لەپەنجەی پێیەوە تا تەوقی سەری گڕی حەزو ئارەزوو بوو ، گەر لەم ئانەدا پیاوێک لەو ئارایەدا هەبوایە دەیتوانی بەئارەزووی خۆی بۆ کوێی بویستایە دەیبرد . سوپاس بۆ یەزدان لەم ئاوەدا نەکو نێرینەیەك هیچ کەسێک بەدی ناکرێ .

تەورەکەی لەدەست بەربوەوە سەر خاکە نەرمەکەی بەرپێی . خاکەکە بەو سپیدەیە جۆرە گەرمی‌یەکی تێدایە ..... گولبەهار مەمکە قیتەکانی دەرهێنا ، خۆی لەسەردەم بەسەر زەوی‌یەکەدا درێژکرد .. خۆی لە خاکە گەرمەکە خشاند ، کە زەردەزێو وردە چەو دەچەقینە مەمکیدا خوێناوی دەبوون ، زیاتر گڕی حەزی حەوزەلی دەسەند ، خوێنی گەشی مەمکی تێکەل بە تۆزی خاکەکە دەبوو ، تاکو تولەرێگاکە نەوەستا لەوێوە پێچی خواردەوە ، هەر لەو بارە تاجێگاکەی پێشووی نەوەستا .

رۆژ تەواو هەلهاتبوو « محمود » پەیدا بوو . تابلێ‌ی پۆشتەیە مل بەستێکی ئالی بەستووە ئاو لەچاو دەردێنێ ، پێلاوەکانی لەوبەتەر ، بەرەبەرە لەدوورەوە وادێ واگەیشتە دۆلەکە گەیشتە ئاستی ، یەکتری لەئامێز دەگرن، باوەش بەیەکدا دەکەن لەیەك بەتەر بۆ یەکتری سووتاون . محمود ئەوەندە پۆشتەو پەرداخە وەك شاری‌یەکی راستەقینە پیاو شەرم دەکات دەست بهێنی بەکەلو پەلەکەیدا « دورمش » لەولاوە وەستاوە زاق زاق تەماشای « محمود » دەکات . دەلی‌ی لەورۆژەوە لە دێ دەرچووە گەرمی‌و ساردی نەدیوە ، تەراشی کردووە روومەتی وورشە ورشێتی .. « دورمش » راوەستاوە پێ‌دەکەنێ .. بەرامبەر یەکتر راوەستاون . بوخچەیەك بەدەسیەوەیەتی لەدەستی دەکەوێ . پیرە بوخچە سیخناخە . محمود هەموو گیانی تکایە ، لە گولبەهار دەپارێتەوە ، داوای لێ‌بوردنی لێ‌دەکات .

« محمود » دەلێ : ئەمە حال‌و حیکایەتەکەیە هیچ چارەیەکم نەبو وا گەراومەتەوە .

ئەوەی ئەو دەیوت گولبەهار هیچی لێ نەدەبیست ، لەشی ئاگری عیشقی دووری سووتاندبووی ، کوژراوی چاوەڕوانی نۆسالی رەبەقە . وا بەرامبەری راوەستاوە .

محمود دەستی درێژکرد دەستی دەستوکا . گولبەهار دەستی دەکێشێتەوە ، خۆی بادا بەدەستەوە ، دەچێتە پێستی پلنگەوە . شالاو بۆ محمود دەبات . بەنینۆك روومەتی ئەورووشێنێ . دواجا خۆی دەگرێ ، لەدلەوە پەشیمان دەبێتەوە لەو بارە نامێنێ ، هەر وەك هیچ رووی نەدابێ دانەکانی جیڕ دەکاتەوەو بەدەنگێکی بڕ لەقین دەلێ :

**« هادی سەگ‌ی کو ... نارِەسەن .. هادی‌ی‌ی »**

محمود هەر دەپارێتەوە ، کە دەزانی پارانەوەکەی بێ‌سوودە رووی وەردەچەرخێنێ لێ‌ی دەدا دەڕوا ، گولبەهار تەماشای دەکات بەرگە نایابەکەی ، پێلاوە بریقەدارەکەی ، کراسە ئالەکەی قژی سەری لەتۆزی رێگاکە نیشتوون ، هەنگاوە لەرزۆکەکانی دل دەکا بەبوریان ، سەرەرای ئەمەش بوخچە پڕەکە بێ‌ئاورِ دانەوە بۆ دواوەی تورِدەدات .

**« هادی نارِەسەن .. هادی‌ی‌ی »**

بەتەواوی هەموو لایەك رووناك بوەتەوە ، دەغلەکان گولە بەرۆژەکان، زەوی‌یە قوڕاوی‌یەکەی ئەولای ، بڕە دارەکەی تەنیشت دێ ، رۆخی رووباری « جەیحون » کە وەك شریتێکی سەوز کشابوو ، تیشکی رۆژ پۆشیبوونی . تا دەهاتیش ئەوناوە گەرم دادەهات ... « گولبەهار » چووەتە سەر گابەردێك لەدواوە تەماشای دەکات ، چاوی لێ نەتروکاند تاکو تارمایی‌یەکەی لەناو تۆزی رێگاکەدا توایەوە ، چاوەکانی پڕ بوون لەفرمێسك. لەسەر گابەردەکە دابەزی ، دەستی کردە دروێنەی گیای ناو پەمووەکە ، دەمی داسەکەی لە کەسەکلە گلینەکە دەکەون وردو خاش دەبوون ، بێ‌وەستان بۆ ماوەیەك خێرا خێرا بالی دەوەشان ، سەروملی لە تۆز نیشتووە ، لەشی لەناو گڕی گەرماکەدا دەکولا ، تەقەلاو ترسی « محمود »یش هەموو شتێکی لەبیر بردبوەوە .

چێشتەنگاوێ درەنگ کاتێ نانی دەخوارد ، بەرەبەرە هاتەوە سەرخۆی ، لەبەر خۆیەوە بزە دەیکرت ، لەناوەوە لەگەل خۆیدا دەدوا : « محمود » ئەم جارە بهاتبایەتەوە .... ئاە چی دەبێ گەربێتەوە .. هەرچی کردبێ گەردنی ئازابێ .. هەرچی بکات لێ‌ی‌دێ ... با با ژنیشی هێنابێ هەر گوێ‌یشی نادەمێ ... باپێنج مندال لەگەل خۆدا بینێتەوە بەس بێتەوە بێتەوە . لەنان خواردن بوەوە ، دەستی کردەوە کارکردن ..

ڕەوی ئاسنێکی داخکراوە . پێی دەنێتەسەر ،
ـەی لەچاو دەردەهێنا ...

هەمدیس پۆل پۆل قولینگان بەسەر سەریا تێپەڕ دەبوون . دەبوونە کۆمەڵێ خاڵی ڕەش ڕەش بەگەواڵە هەورە سپیەکانەوە . هەندێ جار سێبەری گەواڵە هەورەکان . هەندێ جاری تریش سێبەری پۆلی قولینگان دەکەوتە سەر زەوی‌و گورج تێپەڕی دەکرد... لەبەیانەکی زووەوە « گولبەهار » وا لەناو کێڵگەکەدایە ، تا ئێستاش ـ هەندێ جار نەبێ ـ بێدەنگ‌و مات مات تەورەکەی بە دەستەوەیەو ڕاوەستاوە ...

جارێکی‌کەش تەورەکە بێ‌ترپە لەدەستی کەوتە سەر زەوی‌یە نەرمەکەی بەردەمی .

گولبەهار لەشی گڕی سەندەوە . منالێکی بچوکیش بێت دەستی بگرێ بۆ ناو دەغلەکان پەلکێشی دەکات ، بێ ورتە دەکەوێتە دوای . لەشی ئارەزووی لێ دەتکێ ، هەستێکی سەیر دایدەگرێ ، بۆنی چزیلکی سووتاو خەریکە کاسی دەکات ....

مەمکەکانی دەرهێنا ...

خۆی بە زەوی‌یە گەرمەکەدا دەدا .

دڕک‌و وردە چەو پیادا دەچەقن‌و خوێناوی دەکەن .

گۆشت‌و ئێسک‌و قژی ، ئارەزوو و حەزێکی پیسیان تێدا دەزێ . سەر شاخەکان بەتەواوی سپی هەڵگەڕان ، لەزەوی‌یەوە بەردەوام تەمێکی خاو بەرز دەبێتەوە . چی دەبینێ !! لەناو تەمەکەوە « محمود » بەرە بەرە نزیك دەبێتەوە . گولبەهار لە خۆشیاندا پێی زەوی ناگرێ ، بەدەوری خۆیدا سووڕێک دەدات ، دواجا ڕاست بەرەوپیری دەچێ...« محمود » بەرگێکی پاك‌و تەمیزی لەبەردایە ، کراسەکەی ئاورێشمە ، دەستەسرێکی سپی بەیەخەدا کردووە ، پێڵاوێکی بریقەداری لەپێ‌یە ، برژانگی نشتۆتە سەر گۆنای هیچ نەگۆڕاوە . بزەدەیگرێ . بزەکەی دەبێتە پێکەنین ، لەدڵەوە پێدەکەنێ ، لەبەر خۆیەوە شتێک دەڵێت ، باوڵێکی گەورەی بەدەستەوەیە ، پیرە جانتا ئاوساوە ئەوەندەی کەل‌وپەلی تێ‌ئاخنیوە پڕە لە کەل‌پەلی منالانە ، ئاوێنە ، بازن ، ملوانکە پێڵاو ... « هادی سەك هادی‌ی‌ی‌ی » .

محمود لەم دەنگە ترسێنەرە دەسڵەمێتەوە ، دەترسێ . تا پێی بگرێ بەرەو دوا ڕادەکات . « گولبەهار » جارێکی تریش سەردەکەوێتە سەر



گابەردەکە . تا تارمایی‌یەکەی لەناو تۆزە سوورەکەدا وون دەبێ چاو ناتروکێنێ .

کە « محمود » لە چاو وون دەبێت ، جارێکی تر پەشیمانی دایدەگرێ « خوا دەکات ئەمجارە دێتەوە خۆڵی ژێر پێی ماچ دەکەم ... نایەڵم پۆشێك بەسەر پۆشێکەوە بنێ ... خۆم ... چیم .. ئەو بخوات‌و ....

تیشکی خۆر ئەو دیو بڕە چنارە ووشکەوەبووەکانی گرتەوە ... تەورەکەی لەدەست بەردەبێتە سەر خاکە نەرم‌و داخبووەکە ...

مەمکی‌ی خویناوی دەخشێنێ‌بە ...

کە سەری بەرز دەکاتەوە ، چی ببینێ باشە .... وا « محمود » ئەسپ سوارێکە ، ئەسپەکەی ئەوەندە جوانە نەبێتەوە.«محمود»یش سوارە نەگاڵتە ، جزمە سوارانەکەی ، سمێڵی قیت‌و بادراوی ....

دەستی بۆ درێژ دەکات ، ئەوەندەی نەمابوو لە ئەسپەکە بیهێنێتە خوارەوە ، ئاوزەنگی ، زین ، نەرمەزین سەرتاپا بەئاوی زیو نەخشێنراوە ..

سورمەچنە . بریسكو هوڕێتی .. محمود دەستی بۆ درێژ دەكات . گولبەهار دەستی دەكێشێتەوە. محمود دادەبەزێ . دەیەوێ دەستی دەستۆكا ، گولبەهار لە ئامێز بگرێ .

**« هادیی نارەسەن .. هادیییی »**

محمود ئاوزەنگی لە ئەسپەكەی دەدا ، ئەسپ باڵدەگرێتەوە ؛ بەسەر دەغڵو گولەبەرۆژەكاندا .

گولبەهار ئاوێنەیەكی بچوك دەردێنێ ، تەماشای خۆی دەكات .

ئەوەی بۆ « محمود » گوێزایانەتەوە دەبێ تەمەنی چەندبێ ؟!

پارچە پەمووەكەی گولبەهار چاكی هێناوە . هی خەڵكی یەكاویەك ببڕێت . نەمەی گولبەهار یەك بەپێنج دەبڕێ . تەماشای پارچە پەمووەكە بكەیت سەرت سوڕ دەمێنێ، تۆپەڵ تۆپەڵ پەمووی سپی لە قۆزاغەكانەوە دەرپەرپوەتە دەرەوە . یەك دوو قۆزاغەی كردەوە ... لەشی داهێزراوە ، شەوی رابوردو چاوی نەچووەتە خەو ، چی لە ترسانا چی لە ... لەم كاتەدا كە قۆزاغە پەمووی دەكردەوە ، فرەی ئۆتۆمبیلێكی بیست ، سەری بەرز دەكاتەوە ، تا دەهات ئۆتۆمبیلەكە نزیك دەبوەوە ، نزیك بووەوە ، ئۆتۆمبیلەكە لەتۆزا غەرقە ، محمود دادەبەزێ ، گولبەهار تەماشای محمود ناكات . زەوی داخ بووە ، گولبەهار لەسەر یەكە پێی دەگوێزێتەوە .

محمود دەستی بۆدرێژ دەكات ، عوزری بۆ دێنێتەوە ، دەپاڕێتەوە بەڵام ئەم گوێی پێنادا ، لەژێر بنجێكدا چەند بەچكە پەلەوەرێكی تازە سەر جوقاو زربوە زربویان لێ‌هەڵدەسێ دەنوكیان كردۆتەوە ، لالفاوەیان زەرد دەڕوانێ .. گولبەهار قوڕگی دەگیرێ ئەیەوێ شتێ بڵێ ..

**« هادیی نارەسەن هادیییی »**

تەماشای دەستی خۆی دەكات ، لە دوو لقەداری وشكەوەبوو دەچن . نۆ ساڵە زستانو هاوین لەناو خۆڵو قوڕدان ، بەردو دار دەكێشێ، هەر باشە ماوە ، پێی لەناو سیانەو قوڕولیتەدا رەش هەڵگەڕاون ، نینۆكی درێژو چڵكن .

**« هادیی سەكیی ... هادیییی »**

دەنگی دەرناچێ . محمود پەلكێشی دەكات بۆ ناو ئۆتۆمبیلەكە ، ناوەوەی نەرمو خۆشو فێنكە ... فرەی ئۆتۆمبیلەكە گوێ كەڕ دەكات ، ئەو ناوەی هێنایە لەرزە ، ئەوەندەی زانی گەلێ لەپارچە پەمووەكە دوور كەوتنەتەوە !

**محمود دەڵێ :**

**— « گوێی مەدەرێ »**
**— « پەمووەكە زۆرە »**
**— « ئەم تۆزە پەمووە چییە ؟! »**

گولبەهار تا هێزی هەبوو هاواری كرد ..

**« هادی هەی نارەسەن ، ئەمە نۆ ساڵە من خزمەت ئەم كێڵگەیە دەكەم ، هادی سەكیی ... هادیییی » .**

دەرگای ئۆتۆمبیلەكەی كردەوە ، خۆی فڕەدایە خوارەوە ، .... بە بەسەر زەوییە گەرمەكەدا كردییەكێش ... مەمكەكانی خوێناوی بوون . لەشی هەمووی لەناو تۆزدایە .... پۆل پۆل قولینگان رەت دەبن . پڕ بەسینەی ، پڕ هەردوو كونە لووتی بۆنی كێڵگەكە هەڵدەمژێ ، هەڵدەسێ . پشتی كەمێ چەماوەتەوە . خەریكە ببوورێتەوە . كەمێ هۆشی دێتەوە بەر . قۆزاغە پەمووەكان كۆدەكاتەوە سێبەری پۆلێ قولینگ دەكەوێتە سەر پارچە پەمووەكەو تێپەڕ دەبێ دواجاش سێبەری پەڵە هەورێك .

گولبەهاریش سەرسامو بێدەنگ دەڕوانێ .... بەتەنیا لەناو كێڵگەكەدا راوەستاوە بۆ دوور دەڕوانێ .

●

**● بێجگە لە گەلێ رۆمانو نووسینی بایەخداری كە زۆربەیان بۆ زمانە زیندووەكانی جیهان وەرگێڕراون ، كۆمەڵی چیرۆكی كورت**

**بەناوی « Bütün Hikâyeler » ، موە چوار جار بەچاپ گەیێندراوەو بۆ گەلێ زمان وەرگێڕراوە .. ئەم چیرۆكە چیرۆكێكی ناو ئەو كۆمەڵە چیرۆكەیە .**

**احمد**

# میرزا شەفیع

محمد أمین هەورامانی



شاعیرێکی بە تواناو بیرتیژو بلیمەت بووە .. بە شێوەی گۆران شـــــیعری وتووە . زاری

شیعرەکانی ، شـــێوەی شارەزووریی کۆنیـان بەسەردا زاڵە ، لە رووی وشــەو موفرەداتەوە ، پڕن لە هی فۆلکلۆری کۆنی باووباپیرانمان ، ئەگەر

خوێنەر ئاگاداری ئەو جۆرە سەرگوزەشتەو رازو نیازە فۆلکلۆریانە نەبێ ، بێگومان تێگەیشـــتنی شیعرەکانی لەلا لاواز دەبێ .

**زوربەی شــــیعرەکانی ، بابەتی دلدارییان بەســــەردا زاڵــە ، ئەگـەرچی شـــیعری نیشـــتمانپەروەریی‌و لاواندنەوەو مێـژوویی‌ی فۆلکلۆریشی هەن .**

**چەرخەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ســــەروکاتوی میرزا ئەلماس ـ خان یـاخود « ســــەرهەنگ ئەلماسخان » کەنۆلەیی‌و نادرشای هەوشاریی ، کە یەکێ بووە ، واتە : سەرهەنگ ئەلماسخان ،**

**له فەرمانڕەوا بابا ئەردەڵانیەکانو نووسەری چەندین بەرهەمی ئەدەبی گەورەی وەك ( یانزەڕەزم ) و ( نادرنامە )و ( بارامو گولەندام ) .... هتد .**

هەروەك شیعرەکانی ( مەولەوی ) و ( وەلی دێوانە )و ( ئەحمەد بەگی کۆماسی ) لەسەر زاری زوربەی شارەزوریەکانی ئێستا لە کاتی

جمجمەمیاندا دەبیستریێ و دەوترێنەوە ، هەروەها شیعرەکانی میرزا شەفیعی ( ڕەزلە )یش جێگایەکی تایبەتیان بۆ خۆیان دیاری کردووە .

بە شێوەیەکی روونتر ، شیعرەکانی زۆرتر بە زارەکی دەبیستریێن تا وەکو لەناو رۆژنامەو گۆڤارەکوردیەکاندا . چەند پارچە شیعرێکی لە رۆژنامەی ( کوردستان - ی - تاران - دا بلاو بوونەتەوە . بۆیە لێرەدا بە هەلی دەزانم داوا لە

برادەری ئەدیبو ئەدەبدۆس دەکەم ، کەچیی ، دەربارەی سەرگوزەشتەی میرزا شەفیعو شیعرەکانی ، لایانەو دەیزانن ، بە هانامانەوە بێنو ئێمەیشو مێژووی ئەدەبی کوردیش زۆر بە دلسۆزیەوە رێزیان لێدەگرین ، بۆ ئەوەی بە هەمووڵایەکمانەوە بتوانین بەرهەمەکەی لە چاپ بدەین .

لە مێژووی ئەدەبی‌کوردیی - مامۆستا عەلائەدین سەجادی ، لە لاپەڕە ( ٥٨٧ )ی دا ، بە میرزا شەفیع - ی چامەڕێزی دەلۆیی ، ناوی بردووەو بۆ درێژایی تەمەنیشی ، سالانی ( ١٧٨٥ - ١٨٣٥ )ی زایینی دیاری دەکات ..

**چەرخەکەی دەگەڕێتەوە ، بۆ سەروکلاوی نادرشای هەوشاریی ویەکگرتنی لەگەل بابا ئەردەلانیەکانا بۆ بەگژا چوونی عوسمانیەکان ، بە میرزا شەفیع - ی ( دینەوەری )یش ناوبانگی دەرکردووە ، خەلکی ( دێ )ی ( رەزلە )ی کرماشانە ...**

دەگێڕنەوەو دەلێن : میرزا شەفیع ڕۆژی لەڕۆژان دەچێ بۆ سەردانی میرزا ئەلماس-خان، وەختێ کە نزیکی دێی ( کەنوولە ) دەبێتەوەو هەوالی دەپرسێ ، هەوالی‌مردنی دەدەنێو گلکۆکەیشی نیشان دەدەن . ئەویش بە دلو دەروونێکی پڕ لەداخەوە ، ئەچێتە سەرگلکۆکەیو ئەم پارچە شیعرەی لەسەر پارچەیێ قاقەز دەنووسێو ئەوجا بە دلیریەوە دەگەڕێتەوە . باشان پیاوچاکێ پارچە شیعرەکەی میرزا شەفیع بە کەس‌وکارەکەی میرزا ئەلماسخان دەگەیەنێت . ئەمەش پارچە شیعرێکە جگە لەوەی ، کە گەوهەرێکی هونەریی زۆر بەپێزە لە رووی مێژوویشەوە جێگای بەهاداری خۆی دیارە ، بەوەی کە چەرخی میرزا شەفیعو ئەلماس خان - مان بۆ دیاری دەکات ..

**میرزام خامۆشان ، . . . . . . . . . .**
**موبارەکت بۆ ماوای خامۆشان**

**نۆشت بۆ بادەی بێ‌هۆش نۆشان**
**رەفێقی مەجلیس جەرگەی مەی نۆشان**

**تۆمید وە نیمجاز دۆعای خاسان بۆ**
**سزای گۆڕِ نەفشار وەلێت ئاسان بۆ**

**دمای « ئەلماس خان » خان لال شێوە**
**کرە « نەیدە » کەس نەیۆ پێوە**

**میرزام یەك دەردێ لێم بییەن کاریی**
**تۆلەی دەسنیشان ژوێت نەداریی**

**فەرزەند هەرخاسەن ، مێوەی باغتەن**
**هەم شادیی و هەم زەوق ، هەم چراغتەن**

**نە هەرخاك بەری جانشینتەن**
**پەی دۆسو دوژمن شادییو شینتەن**

**وە تەفریح مەکەی سەیری باخانت**
**وە ناز مەگێلۆ ، وە دیواخانت**

**وەختێ کە پیری مەکەرۆ قەستت**
**فرزەندی عەزیز مەگێرۆ دەستت**

**ئەر ئیسال جە گول تەلێم کەندە بۆ**
**رۆحم شەرمەندەی خواو بەندە بۆ**

**پەی چێش گول ؟ میرزام ها وەسەرای گڵ**
**گڵ وە دیدەم بۆ پەی چێشمەن گول**

**بار تا بپۆشم بەرگێ جە پەلاس**
**بپۆشە « شەفیع » جە دمای « ئەلماس »**

●

میرزام ، تە واران ، . . . . . . . . . .
میرزام ، شابازان تۆڕی تە واران

دایمەلمدام نمو پێشە داران
وێشان مەنمانان جە سەر دیاران

نانە ڕاش بییەن دیارە کەردمن
تمرسان جە صەیاد کەنارە کەردمن

نمر بەندەت قابل مەصلەحەت زانان
دمردی حال وێت پەرێم کیانان

مەبۆ نەی عەزیز ؛ نووری دیدمو دل
دەسگای صەیادان بکمری حاصل

جە پارچەی مەینەت جامێ بۆ رازی
تۆڕدامێ جە هوون جگمر بازی

فەصلێ جامەوهوون تەمام بی وەهمم
نە ئەساسەی وێت خاطر کەردی جەم

نە گوزمرگای باز شۆخی شیروانی
تە نە تۆڕداومێ وەبێ گومانی

وێت بە عید نەدام نە تەکیەی کەمین
ساکن بەر پەی وێت نە پەستی زەمین

مۆرغی دل چون صەید پاش بەستەبۆ
گاگا نە پەرواز ، گاگا خەستەبۆ

مەعلوومەن بازان هەمر صوب نێواران
مەکەران پەرواز پەرێ شکاران

مورغی دل نە خۆف شەقەی بالی باز
پا - بەستەو زەلیل مەیۆ نە پەرواز

●

تەوار تێژپەڕ کەس نەکەردەدام
مەشانۆ پەی مورغ مەپێچۆ نەڕام

نەمانەت فەرضەن میرزای خاطر تەڕ
فەصلێ کەفت نەدام تەوار تێژپەڕ

با شێوەی کردار صەیادان پێت بۆ
نامت چون جاران وەفای وێت بۆ

وێت بکەر پەرێش سەرسامانە سەخت
وە نوموووری صەبر بێ تەعجیلو جەخت

هەمر تەنمك تەنمك پا بنیەمر نەپێش
تا تەوار تۆڕ نەتەرسۆ جە وێش

ڕەهاش کەمر نەدام وێنەی صەیادان
بگێرەش نە دەس خەندانی شادان

بازە پەرێش ئینشەللا وەخەیر
جلخوو جە مەوبەت پاچەبەند جە صەبر

جە شابالی عیشق تەبلە تەیارکەمر
نیشارەی حاجەت وەمیر شکار کەر

یەومەن فەیەوەمن خۆشخۆتەر مەبۆ
پەی دانای شکا تەوانکەمر مەبۆ

هەروەخت جەودما بوانیشەوە
مەیۆ بە ئاواز وانای وێشەوە

تەرك مەدۆ عادەت وییەردەی وەرین
مەواچی « شەفیع » صەدجار ئافەرین

●

زلێخا ئەژدەر ، . . . . . . . . . .
دوو سیا سوعبان پڕ پێچی ئەژدەر

چەنی مار وەچان زەنەندەی خەتەر
ساندا چون سەحاب پۆشانك خەومر

تەرسا ئاسا جە حەق نەکردش نەندێش
ئاوەرد ئەساسەی تەرسایی ئەو پێش

نە حوزووری جام جەمنمای بێگەرد
مەشاطە کاری قورصی قەمەر کەرد

نیم تەنەی گولنار زەری بەرئاوەرد
چەنی پیراهەن لەفافەی بێگەرد

پۆشا وە بەدەن خۆرناسای خوردا
گۆیا نزوول کەرد وەروەو کافووردا

بە زەیبو زینەت دیبای زەڕوسیم
رازیا چون حۆر « جنات النعیم »

دوو گۆشەوارەی تەلای ئەحمەری
شەفافتەر جە شەوق زوهرەو موشتەری

مورەصەع وە لەعل یاقووتی کانی
مرواریی غەلطان نەجمی نەیسانی

نووست ئەوسای کەلاف سیای بۆعەنبەر
مەر طلوع نوری خورشیدی خاوەر

تەوقی گەردن بەند نادرەی ئەدیم
پەخشان نە ڕووی تەخت لەوحی سینەیسیم

گشت زەنجیرەی زەڕ تەلای دەست ئەفشار

موزەیەن بە لاڵ قیمەتی ئاودار

خەرمی « ئیسلیمی » مەراخل کاری
حاشیەش ئەلماس پایەی مرواری

تیتەش تەمنیشان دانەی دەریای نوور
هەردانەش مایەی خەزانەی فەغفوور

ئەسای ماروەچان شەبدای شەرفرۆش
بە مەحکەم بەستەن ئەزمنارەی دۆش

تیتەی مورەصەع یاقوت‌و گەوهەر
دانەی ئینتیخاب گەنجی بادئاوەر

نە خەلیط مەصنوع کارخانەی فەرەنگ

قولاپش نە فەوق سەروین کەرد مەحکەم
مەنمانا چون جام ، جەهان ـ نمای جەم

ئاما تا وەبان لەوحی پێشانی
مەر نەقش ئەژمەر ـ ژەنگ نە صەفحەی مانی

کەمەرەی کەمەر تەمنیشان لاڵ
مەندەی یادگار هومەیلای شەمباڵ

تەمام تەمنیشان جەواهێر دانە
هەر دانەش نەگەنج شاهان نیشانە

بەو کەمەرەی لەعل نادرەی شاران
کەمەر بەست پەی قەتڵ شەو زیندەداران

بە گەردی سورمەی تەجەللا کۆی «طور»
ڕەشتە وە عەینەین غەزاڵەی مەخموور

لۆنگی جە زەربافِ ئاڵای فەرەنگی
بەستەوە پەی حەپس ماراتی جەنگی

نیم تاجی خەراج جە غەرب تا بە شەرق
نییا چون فرزەند شای هورمز نەفەرق

طەرحی طەرابیح شەوبەندی چین چین
مەر چینی شەوبەند گوڵ ـ ئەندامی چین

چینش پەی زینەت ماچین کەرد عەیان
نەحشین کەرد نەخشی گرۆی نازاران

گرتش کرکرەی مینای مەی وەدەست
بینای تەقواوزوهد صووفی بان شکەست

نوشا دووسی جام بادەی ساقی مەست
سەروەش بی جەی مەخێزاو زونار بەست

سا بەو ئاوورەنگ ئاشۆ نەنگێزن

قیام کەرد ئامەت قیامەت خێزن

برقەی زونارش کێشا بەسەردا
ئاهێر وەیانەی دین داران وەردا

نیدای مونادی ئاما جە سەردا
ئەوەڵ وەیانەی حاجی خەوەردا

بە صەد ئەزاکەت لەنجەو لارەوە
بەو ئەساسەی کوفر ، بەو زونارەوە

بەو عیشوەو غەمزەی زاهید فریون
غارەتچی ئیمان یانەی دین شێون

خەرامان وەناشیی پەی کلیسا
پەی ڕەواجی دین مەنسوخی عیسا

حەیف شەخسی پەی تەور شیرین دەستوور بۆ
گومرای بت ـ شناس نە مەذهەب دوور بۆ

شەرمەندەی دیوان یەومەلەحشەر بۆ
ئەغراش سفتەی نار سەختی سەقەر بۆ

●

شیرین ساراکەرد ، . . . . . . . .
یەك ڕۆ پەی گولگەشت عەزم سارا کەرد

وێش چون قورصی خۆر عالەم ئارا کەرد
کەنیزان بەنیب زەینەت دارا کەرد

فەرماش ئاوەردن چەند خانەزادان
« شامی » ئەتیجان ، « ئەجدی » ئەژادان

پەی شیرین غولام ئەسلی تەرسایی
ئاوەردش فەرەس مەلەك فەرسایی

شیرین قامەت ، قامەت قیام کەرد
پا نییا ڕیکاب ڕامی ڕەهنەوەرد

جەنیش کەنیزان شەهدی شەکەرڕێز
سوارین چون تیپ « خسرەو پەروێز »

گا ، هەوای کۆسار ، گا ، تەماشای دەست
گا ، سەیری گوڵزار ، گا ، عەزمی گوڵ ـ گەشت

گا ، مەیلی کەمەند ، گا ، چەوگان بازی
گا ، جەولانی ئەسپ ، گا تیراندازی

منیچ خۆ مایل هەوای نەفسانی
بازی وەردەی مەکر زەمانەی فانی

تەبدیل بیم وێنەی بێ ئەوای شاران
بارکێشی مەینەت زۆری ڕۆزگاران

پەی بەهانەوە دەم دەمو کەم کەم

تا ئەزدخۆران گولباغچەی ئێرەم
جە ئەزدیکشان دیم سیا سەنگێ
بەتەرتەر جە من ماتو بێ دەنگێ

وێم دست نە سایەی سیاسەنگ بێ دەنگ
منیچ سەنگێ وێنەی سیاسەنگ

ساتێ مەشغوول بیم وە تەماشان
وەسەیر گوڵ ـ گەشت ئاماو لواشان

هەر ئەوسام زانا شیرین دیاوە
من دیی نە سایەی سەنگە سیاوە

ئەرِدەس پەی دەسەی خەدەنگان دەس بەرد
وە خەدەنگاندا دیاو ئەزەر کەرد

ئینتیخابش کەرد خەدەنگێ گولزەرِ
سەهم سپەرسم ئەخشی عوقاپ پەرِ

بێرِام دڵدۆز پەیکان جێ بەیوەند
ساختەی صانیع بێ مشیلو مانەند

پەیکان جە پەیکان سورمەسای ئەلماس
زەهر ئالووی کامزەهر ؛ زەهری هەفتەمتاس

خەدەنگێ ئەو مەوج قەوس فەضادا
فەضا پەی عەزای من تەقاضادا

دوو پا ئەریکاب مەرکەب مەحکەم کەرد
دەستی چەپ ستوون راستش خەم ئاوەرد

دووزاغی کەمان عەنبەرین فامان
ڕوو بە ڕوو ئامان ، ئامان چو ئامان

چەنی سێ پەرِداڵ سەرنییان وە هەم
سەرگۆشی کەردن ساتێ چەنی هەم

وێنەی قاتڵان هەرپەنج پەی ستەم
دەستی شەرتو عەهد دان ئەو دەستی هەم

هەر ئەوسام زانا دەس جە هەم وەردان
خرۆش کەفت نە چەرخ سەحراو سەرهەردان

دیم کرێ ئاما نە ڕیشەی جەرگم
نیشاندا قەیران نیشانەی مەرگم

گوزەر کەرد نە جەرگ سەهمێ سەهمناك
جە سەنگ پەرِان کەرد تاپەرِنیشت ئەخاك

سەیلی هوون سەرکەرد نە ڕووی زامەوە
نە سای سیاسەنگ سەر نیامەوە

وە صەد ئەزاکەت شای شیرین سوار
مەهمیز دا نە ڕەخش ڕەوەندەی ڕەهوار

بە شادیو نیشاط وە خەندە کەردە
چون صەییاد شکار وەدام ئاوەردە

ئاما وە بالین جلەو مەندەر کەرد
وە زامانەدا دیاو ئەظەر کەرد

واتش : هامسەران ، یاوەران ، یاران
عوزری تەقصیرم مەسموع بداران

کەبووتەر فەصلێ مەرگش ئەزاوەن
بێ صەبرو ئارام ، بێ خوردو خاوەن

لازم پەیک مەرگ وە دانەی ئەمەل
مەکێسۆش پەی دام صەییاد ئەجەل

وەر نە من جە کۆ ، ئەی غەریب جە کۆ !
ئەی قەتڵ ناحەق بێ تەقریب جە کۆ !

« حاجی » وەس بشۆ نە شۆن ئەظەر
دایم ها نە شۆن ئەظەرها خەتەر

●

ناز تەتاریکم ، . . . . . . . . . .
یاران من زامین ناز تەتاریکم

پێکیای خەنەنگ تیر خاریکم
کوشتەی شەست قەست کەمانداریکم

لێویای لێوەی شەکەر لێویکم
شێویای شێوەی لەیل خەدیوێکم

خەم خەیالیخاڵ ، ماوی خلێکم
زوان لەنگو لاڵ سپی لالێکم

سیا خەیسەکەی بێدی کەیلێکم
سفتەی کەی زوخاڵ « کەتۆن » پێلێکم

تەن سووزیاکەی بیستوونێکم
وێران ماڵەکەی دڵ زەبوونێکم

پۆس نە کۆلەکەی دیدە لەیلێکم
ماوا چۆلەکەی ڕای دوجەیلێکم

تەنیا دارەکەی سەر دیاریکم
باد وەڵگ بەردەی سفتە زاریکم

ئەمەد پۆشەکەی شارە چینێکم
سیا پۆشەکەی گوڵ جەمینێکم

هیجران کێشەکەی دەروون ریشێکم
جەفا پێشەکەی کافر کێشێکم

پا ، ئەدامەکەی خەیاڵ خامێکم
سیا جامەکەی جەمین جامێکم

شێخ صەنعانەکەی تەرسا وەشێکم
ئارا گێلەکەی بێدی بەشێکم

من پیرەکەی مەس دیدە مەسێکم
کوشتەی نیش زام مژەی شەسێکم

●

چراخم بە دەس ، . . . . . . . . .
بەعزێ کاری سەخت زوو مەیۆ بەدەس

یەك شەو چەنی لەیل شۆخی دیدە مەست
بە عەزمی دڵواز جە ناغم شکەست

زەمانێ جە بەین بازیمان وییەرد
زانام لەیل بازیش مەحو خاتر کەرد

دەسێ گوڵسۆسەن عارفانم بەست
عاجزا نەوار نییام نە ڕووی دەست

واتم عەجەب گوڵ ، چە وەش مەیۆ بۆش
دەس کێشا بەردش ، واتم فەرامۆش

یەکجار نە رووی خەشم کەردش تەماشا
زەردە خەندەش کەرد وەعەزمی خاشا

واتم : بینایم کەردەت حەلالەن
حاشا وەکەللا ، بەرێت زەوالەن

واتش : نەقدو جینس هەرچی مەوازیی
مەدەروون پەنەت جە تەنخوای بازیی

واتم : شەرتمان جە ناو وییەردەن
من بازیم جە سەر دلوازیی کەردەن

مە بییا ڕۆی ئەزەل بازی نەکەردای
بەلکە تۆ بازیی جە من مەوەردای

گرتم لۆی لەچەك لەچالی تینش
دەم بەردەم پەی لەعل پای حەلقەی بینش

لەب چەنی لەبان بە هەم پەیوەستم
سەرچەشمەی حەیات گنا وە دەستم

گرەو بەردە بێم ، دنیام بە کام بێ
نۆشم بی نۆشام ، تا تەوانام بێ

وات : وەسەن « شەفیع » کافیێەن کافی
وەس تەقلادەر جە بێ ئینصافی

نە مەندەن شەربەت نە تۆی حوقەی زەڕ
هەنی حوقەی زەڕ جێش نمەبۆ بەر

واتم : دڵ پەرێت عەهد فانی بێ
مەتلەبم پەی ئاو زیندەگانیم بێ

جورعێ لێش نۆشام . ئیحیام کەردەوە
هەنی نیم وە تەنگ وەلگ دەردەوە

ئەو فەصلە گرەو چەنی لەیل کەردم
جە ساوتەقویم وەیاد ئاوەردم

سارەم نە بورج جیلوگەریی بێ
نەظارەی قەمەر جە موشتەریی بێ

وەر نە هۆش لەیل سەوڵ خەرامان
صەد چون هۆش من مەنیا وەدامان

ئەر بشم بە ڕۆم تا وە ئەسەمۆڵ
بە یادی خاڵان طەی مەکەرووم چۆڵ

ئەربشم دەسەمت حەوێزەو دیزفوول
دڵ وە تۆ شادەن بە خوداو ڕەسوول

ئەر بشم وەسەیر وەلاتی حەلەب
دڵ خواهان تۆن ، هەر تۆشەن طەلەب

ئەربشم وەخاك کابول یا کشمیر
باز هەم مەیلی تۆم مەبۆ دامانگیر

ئەر بشم وەخاك پاك موقەددەس
ئازیز دامانت وەر نادەم جە دەس

ئەر بشم ئازیز وەلای بەندەرات
یەك گیانەن ( باللە ) مەکەروون فیدات

ئەر بشم وەسەمت وەلاتی بەندەر
نەمەشیم جە ویر سەولی نازپەروەر

ئەرخوا نەسیو بکەرۆم کەعبە
غەیر جە تۆ جەگشت مەکەروون تەوبە

ئەر بشم ماوا وە مەکان شووشتەر
ددان کەندەت نیم جەمین قورصی خوەر

نە گشت بابەتێ خاتر بکەر جەم
ئەر وەفاداری مەیلت نەبۆ کەم

ئەر تۆیچ چون لەیلێ وەفا جە لاتەن
من دیدەوگیانم نەخاك و پاتەن

هەروەك بییاوون مەن وەخاکی پات
گیان مەکەم وە نەزر خالانی ئالات

با هەر پێم واچان گەدای کەلپۆش پۆش
من هەر غولامم عەبدی حەلقەگۆش

دەسم دامانت شای ساحێو وەفا
نەسپەردەی حەق بای باقی « الدعا »

●

# لەژێر رەشماڵی شیعری کلاسیکی کوردیدا



ریپۆرتاژێك دەربارەی :

## دیدارەکەی شیعری کلاسیکی کوردی

دەزگای رۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی دیداریکی بۆ شیعری کلاسیکی کوردی لە سلێمانیدا سازکرد سێ رۆژی خایاند بەدانیشتنی بەیانی‌و ئێوارانەوە .

سەر لە بەیانی رۆژی ١٩٨١/٤/١٤ لە سەعات (١٠)ی تەواودا دیدارەکە کرایەوە ، لە سەرەتادا وتەی بەخێرهاتنی میوانەکان بە هەردوو زمانی کوردی‌و عەرەبی پێشکەش کرا ، کە بەخێرهاتنی بەرێز پارێزگاری سلێمانی‌و نوێنەری حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست ـ لقی سلیمانی‌و کاربەدەستان‌و مامۆستایانی زانکۆی سلێمانی‌و ئەدیب‌و رۆشنبیرانی دیدارەکەو میوانەکانی تێدابوو ، هەروەها لەو وتەیەدا دەست بۆ ئەوە کێشرا کە دەزگای رۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی وەك دەستکەوتێکی بەهای شۆڕشی ١٧ ـ ٣٠ تەموزی پیرۆز بەردەوام دەبێت لە خزمەتی رۆشنبیری گەلی کوردو یەکێتی

نووسین و ئامادەکردنی
مستەفا صالح کەریم

جارێکی دیش شاری سلێمانی پێشوازی
کاروانی روناکبیری کوردی کردەوە ، بەیانی

رۆژی سێ شەممە ١٤/٤/١٩٨١ هۆڵی فارابی لە
زانکۆی سلێمانی باوەشی بۆ ئەدیبانو روناکبیران
کردەوە تا وەڵامی سەلامی نالی بدەنەوە ، لە ژێر

رەشماڵی شیعری سالمو کوردیدا بحەوێنەوە ،
سەرێ لە خانەقای مەحوی بدەنو چاوی
بەکتێبخانەو شیعرەکانیا بگێڕن .

دیدارمان ، دیداری شیعری کلاسیکی
کوردی‌یە ، ئیمرۆ یەکەم رۆژی زەماوەندی
شیعری کوردی‌یە ، سەرەتا مامۆستا ئیسماعیل

رەسول بەرێوەبەری گشتی دەزگای رۆشنبیری‌و
بلاوکردنەوەی کوردی بە خێر هاتنی میوانەکانی
کردو لە وتارەکەیا باسی چالاکیەکانی دەزگاکەی

کرد لەوانە میهرەجانی یەکەمی روشنبیری لە
هەولێرو هەروەها دەربارەی پەیوەندی بەتینی
نێوان ئەدیبانو دەزگاکە خۆشحالی خۆی دەربڕی،

هەر لەم رێبازەشەوە ئەو پرۆژانەی بەدەستەوەنو
نیاز وایە جێ‌بەجێ بکرێن برگەیەکی گرنگ بوون
لە وتارەکەی بەرێوەبەری گشتی‌دا ، لە کۆتاییشا

داوای لە ئەدیبانو شارەزایان کرد کە خۆیان بۆ
دیداری چیرۆکی کوردی ئامادە بکەنو ئەو
باسانەی خراوەتە بەرنامەوە هەر یەکەیان بە پێی
شارەزاییی خۆی بەشداری تێدا بکات .

* * *

لەپاشا ع. ع. شەونم حەسیب قەرەداخی
شاعیری پێشکەش کرد لە باسێکا بە ناونیشانی
[ سالم لەرێبازی کلاسیزم دا ] .



نیشتما نی‌عیراقدا ، لە دواییدا بەرێز مامۆستا
ئیسماعیل رەسوول بەرێوەبەری گشتیی دەزگاکە
وتەیەکی خوێندەوە ، لەو وتەیەدا بەرێز

بەرێوەبەری گشتی دەستێ بۆ گرنگیی ئەم جۆرە
دیدارانە کێشا لە پێشخستنی بزوتنەوەی

رۆشنبیری گەلەکەمانو پتەوکردنی هاوکاری‌و
پەیوەندی نێوان دەزگاکەمانو رۆشنبیرانی
گەلەکەماندا .

جا بۆ ئەوەی ئەو روناکبیرو ئەدیبو
ئەدەب دۆستانەی لەو دیدارەدا ئامادە نەبوون
ئاگاداری بابەتو چەندو چوونو چالاکیەکانی

میهرەجانەکە بن، دەزگاکەمان رووی لە مامۆستای
بەرێز مصطفى صالح کریم نا کە راپۆرتێک لەو

بارەیەوە ئامادە بکات . ئەویش بە دەم
رووڵی نانەکەمانەوە هاتو ئەم ریپۆرتاژەی
خوارەوەی بۆ نووسین .

« بەیان »

* * *

پێشەکی باسەکە لێ دوانی بو دەربارەی ( سالم ) کە تێیدا وتی : لێدوان لە شاعیرێکی وا مەزن هەروا شتێکی ئاسانو ساکار نیە بەلکو بابەتێکی وا گرنگ پێویستی بە ئاگاداریەکی تەواو هەیە لە پێوەندی نێوان ئەدەبو ژیان ، ئەدەبو فەلسەفە ، ئەدەبو ئایین ، ئەدەبو سوفێتی ، ئەدەبو زمان ، شاعیرو دەوروبەرو زەمانە ، ئەمجا باسی ئەوەی کرد کە سالم کێیە ؟ وتی سالم نازناوی شاعیری جوامێری ئەمارەتی بابانە ، کە ناوی عبدالرحمن بەگی کوردی محمد بەگی کوڕی ئەحمەد بەگە ، کە لە نێوان ۱۸۰۰ – ۱۸٦۸ ی زایینیدا ژیاوەو پایەی دوەمی ئەدەبی کوردیە دوای [ نالی ] ، ئەمجا هاتە سەر باسی پێگەیشتنیو

ژیانیو خوێندەواریو پلەی ئەدەبیو کارکردنی ئەدەبی فارسیو تورکیو عەرەبیو زانیاریە ئاینیەکانی ئیسلام لە رۆشنبیری ئەدەبی (سالم)و شیعری ( سالم ) ، دوای ئەمانە قەرەداخی ( سالم )ی خستە تای تەرازوی کلاسیزمەوە ، پێشەکیەکی روونی دەربارەی کلاسیك پێشکەش کرد ، ئەمجا کەوتە بەراوردکردنی ئەدەبی

( سالم ) لەگەڵ کلاسیکدا وەك رێبازو وەك قوتابخانە ، واتە وەك ناومرۆك ، جگە لەمەش بە پێی پێویست بە تایبەتی لە شیعرداو ، ئەو بابەتانەشی روون کردەوە کە لە شیعرو واتای شیعر ئەدوێن وەچەند نمونەیەکیشی لە شیعرەکانی ( سالم ) پێشکەش کرد بۆ چەسپاندنی رای خۆی کە ئەدەبی

( سالم ) کلاسیزمێکە مۆرکی تایبەتی کوردی پێوەیە ، وەمەسەلەکانی خەیاڵو وشەبازیو خۆبەستنەوە بە کێشو قافیەی یەکسەری نیشانەی شیعرەکانی سالمن ، وەهەر تێکەڵ بەم باسە لە تاقی کردنەوەکانی ئەدیب دوا ، کە ئەبنە هۆی مەشخەڵ دانی مەوهیبە زکماکیەکە ، کە لە شاعیردایە ، دوای ئەمانە هاتە سەر باسی مەبەستەکان لە شیعری (سالم)دا ، یەکە یەکە نمونەی شیعری بۆ هێنانەوە ، وە لێرەدا بە ئاشکرا دەستی خستە سەر ئەو حاڵەی کە ( سالم ) شاعیری واقیعی کلاسیزمی بوە ، وەشاعیری پێداهەڵدانو پێداوتن نەبوە ، شاعیری خەیاڵ جوانبوە ، زۆر جاریش دەست نیشانی جێدەستی شاعیرە فارسیەکانی لە شیعری



سالمدا دەکرد ، هەروەها جێ پەنجەو کارتێکردنی زانیاریە ئیسلامیەکان وەك [ فقه ، منطق ، کلام ، زانیاری فەلەك ، بەلاغەی عەرەبی ، مێژووی ئیسلامی ، داستانو ئەفسانە ]ی دەستنیشان دەکردو نمونەی بۆ ئەهێنانەوە .

دوای ئەمانە ئەمجا هاتە سەرباسی کێشو سەروا لە شیعری سالمدا ، وە چۆن سالم شیعرەکانی خستۆتە ناو چواچێوەی کێشە عەروزیەکانەوە وە بە پێوجێی شاعیرانی سەردەم شیعرەکانی دارشتوە ، ئەمجا قەرەداخی لە باسەکەیدا دەستی بە کێشانی هەندێ نمونە لە شیعرەکانی سالم بە تەرازوی عەروزی عەرەبی کرد ، وە ئەو بەحرانە ، دەست نیشان کرد کە بە زۆری سالم شیعری پێ وتوە ، دوای ئەمانەش سلاوو رێزی خۆی پێشکەش بە دانیشتوانو بەدەزگای رۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی کرد، سەبارەت بە بەشداربوونو سازکردنی ئەم دیدارە .

* * *

دوای تەواو بونی باسەکەی حەسیب قەرەداخی دەرگای لێدوانو چەندوچۆن خرایە سەر پشت ، لە پێشا کەریم شارەزای شاعیر وتی : ئاشکرایە کە شیعرەکانی سالم لە سەر کێشی عەروزن بۆیە دەبوایە کاك حەسیب بەو شێوەیەی بخوێندایەتەوە ، نەك بە شێوەی هیجائی .

ئەمجا پزیشكو یاساناسو ئەدیب دکتور نافیع ئاکرێیی وتی : وا بزانم ئێستا لە دەرەوەی

هۆلەکە خانیو مەلای جەزیری بە فرمێـــــکی
لەچاو قەتیس ماوا گەلەپێتان لەرئەکەن کە بە هیچ
جۆری ناوڕتان بەلای شاعیرانی بۆ ئانا نەدایەوە .

کامەران موکری شاعیر هەندێ وشـــــەو زاراوەی راست کردەوە کە بە بۆ چۆنی ئەو لـــە باسەکەدا لەجێی خۆیدا بەکار نەهێنرابوون .

دوای ئەویش ئەدیب سەباحی غالبی وتی :

« شێخ حەسیب وەك بنەماڵە ، لە پەروەردەو فێرکردندا ، وەك شاعیریکیش کە تائێستا جـار جارە لە پاڵ شـــیعری رۆمانسیو ریالیزمیەوە شیعری کلاسیکیش دەڵێ ، بۆ تێگەیشتن لە سالمی شاعیر بە توانایە ، بەلام وەك ( باحث ) نەیتوانیوە حەقی خۆی بە ســالمیدا . چونکە یەکێك لــە مەرجە هەرە سەرەکیەکانی ( باحث ) ئەوەیــە بـە دوای ســـەرچاوەدا بگەڕێو پێوەی ماندووبێ ، دەشبێ ئەو شیعرانەی باسیان لێوە دەکا ساغیان بکاتەوە ، بەلام شێخ حەسیب لەمــەدا نەیتوانیوە سەرکەوتوبێ ، هەر بۆ نموونە تەنیا تەماشــــای دیوانەکەی ســــالمی چاپی هەولێری کردوە ، ئەوچاپەش زۆر هەڵەو ناتەواوی تێدایە ، دەبوایە بۆ ساغ کردنەوە یان گەلێك شوێنو لای کەســانی شارەزا بچوایە ، بە تایبــەتی مامۆســـتا مـەلا عەبدولکەریمی مودەریس کـــە ماوەیەکی کـاتی خۆی بۆ ساغ کردنەوەی شیعری ئەوشاعیرە مەزنە تەرخان کردوە .

هەروەها کاك حەسیب تەخمیسی شیعریکی سالم لە سەر ئەو شیعرەی مەولانا خالید کــە سەرەتاکەی دەڵێ : موسمی عیداســـت .... بەکوردی پێشکەش کرد ، دەبوایە بیزانیایە کــە تەخمیسەکەی ســـالمو شیعرەکەی مەولانا بـە فارســـی بون ، پیرەمێردی شاعیر کردونی بـە کوردیو لە رۆژنامەی ( ژین )دا بلاوی کردۆتەوە . دوای تێبینیەکانی کاك ســەباح مامۆستا رئوفی ئەحمەد ئالانی هەندێ ســــەرنجی زمانــەوانی پیشاندا بەتایبەتی دەربارەی بەکارهێنانی چەنـد وشەو زاراوەیەك .

* * *

دوەم باس لە ئێوارەی هــەمان رۆژدا بـەم ناونیشانە بوو ..

**[ سەرەتایەك بۆ لێکۆلینەوەی شـــیعری کلاسیکی کوردی ] .**



نوسەری ئەم باســـەش کەمالی میراودەلی ئەدیب بوو ، کە شاعیر کاك حەمە سەعید حەسەن پێشکەشی بە دانیشتوان کرد .

کاك کەمال ئەوەی روون کردەوە کە مەبەستی لەم باسە تەنیاً پێشکەش کردنی چەند بنـاغەیەکی مێژوویيو تیئۆرییە ، بۆ لێکدانەوەو لێکۆلینەوەو هەڵسەنگاندنی تەواوی شیعری کلاسیکی کوردی بەبڕوای ئەو دەبێ لێکۆلینەوەی شــــیعری کلاســـیکی کوردی لـەم چوارچێوەگشتیەدا ئەنجام بدرێ :

١ – لێکۆلینەوەی چەمكو تێگەیشتنی کلاسیزم لــە میراتی ئەدەبیو رەخنـــەیی گریـكو رۆماندا .

٢ – لێکۆلینەوەو دیــاری کـردنی تێگەیشتنی کلاسیزمو خاســـیەتەکانی لە ئەدەبیاتی ئەوروپیدا .

٣ – لێکۆلینەوەو دەستنیشان کردنی مەبەست لە زاراوەی کلاسیزمو خاسیەتە تایبەتیەکانی شیعری کلاســـیك لە ئەدەبیاتی عەرەبیو ئیسلامیدا ، تا چ رادەیەك لەگەڵ مەفهومی ئەوروپی کلاســـیك‌دا یەك دەگرێتەوەو ، تاچ رادەیەك لێی جیا دەبێتەوە .. ئەوسا هەر لەو بەراووردەوە ، خاســـــیەتە تایبەتیەکانی ئەدەبی کلاســـیکی کوردیو هـــەلو مـــەرجی مێژوویی لەدایك بوونی ریبازی کلاســـیزم لـە ئـەدەبی کوردیدا دەستنیشان بکەین .

**هەلو مەرجی مێژوویی :**

لە باسکردنێکی خێرای مێژووی کلاسیزم لە

نیهاندا نووسەر گەیشتە ئەو ئاکامەی کە کلاسیزم

ئەدەبی چینی ئەرستۆکراتییەو لە قۆناغی مێژووی پێشکەوتنی نەتەوەو گەشەسەندنی زماندا دەردەکەوێ ، مەبەستی سەرەکیی لە زاراوەی کلاسیزم لاسایی کردنەوەیە ، بە مانای لاسایی‌کردنەوەو شوێن هەڵگرتنی [ کۆمەڵە یاساو دەستوورو ڕێو شوێنێکی ئەدەبی‌و هونەری کە دەبێ لەو ئەدەبەدا هەبن‌و هەموو نووسەران پەیڕەوی بکەن ] . ئەمە خاسیەتی جیا کەرەوەی ئەدەبی کلاسیزمە ، بەڵام دیارە ئەم خاسیەتانە ناوەرۆکو فەلسەفە کۆمەڵایەتییەکە دیاری دەکەن : کە لە کلاسیزمی ئیسلامیدا ، بیری ئایینی‌یە . بۆیە بە باوەڕی نووسەر دەبێ لە لێکۆڵینەوەی شیعری کلاسیکی کوردیماندا ئاگاداری ئەوەبین کە وەکو عەکس کردنەوەیەکی میکانیکی واقیعی کۆمەڵایەتی سەیری نەکەین‌و لێی نەکۆڵینەوە .. بەڵکو دەبێ وەك بەشێك لەسەر خانی گشتی کۆمەڵی دەرەبەگایەتی لێی بکۆڵینەوە ، کە بیری ئایینی ئیسلامی ناوەرۆکی ئایدیۆلۆژیەتی ئەو کۆمەڵە پێك دێنێ‌و هەموو جۆرەکانی تری ڕۆشنبیری‌و ( ئەدەب وەك بەشێك ) لقێکن لەم ئایدیۆلۆژیەتە دەبنەوە .. ئەمە وەکو ڕوانگەیەکی گشتی .

نووسەر هاتە سەر باسکردنی سەرهەڵدانی کلاسیزم لە ئەدەبیاتی عەرەبیی‌و ئیسلامیداو وتی گەرچی دیاردەکانی کلاسیزم لە ئەدەبیاتی جاهیلی‌و سەرەتای ئیسلامیشدا هەن ، بەڵام تەنها لە سەردەمی عەبباسی یەکەم‌و دوەمدا قوتابخانەی کلاسیزم لە ئەدەبیاتی عەرەبی و ئیسلامیدا کامڵ بوو پێگەیشت ، لە ڕووی تەواو کردنی بناغە ئەدەبیی‌و ڕەخنەیی‌و هونەرییەکانیەوە . ئەمەش لەبەر ئەوە بوو کە لەم سەردەمەدا حوکمێکی ئەرستۆکراتی ئیداری درووست بوو – و بزووتنەوەیەکی هیومانیزم ( ئینسانیەت ) بەرپا بوو .. کە بریتی بوو لە بزووتنەوەیەکی ڕۆشنبیری بەر بڵاوە ، ئاڵوگۆری ڕۆشنبیری‌و کەلچەری نەتەوەکانی ئیسلام‌و گەلانی ترو ، تەرجەمە کردنی سەدەها کتێب لە یۆنانی‌و ڕۆمانی‌و هیندی‌و فارسی‌و .. زمانەکانی ترەوە .. بەسەدان کتێبیش دەربارەی ئەدەب و ڕەخنەو شیعرو شاعیران نووسران . بەکورتی لەم سەردەمەدا بناغەو دەستوورە ناسراوەکانی ئەدەبیاتی کلاسیزمی عەرەبی‌و ئیسلامی هاتنە تەواوبوون‌و پێگەیشتن .

لە باسکردنی کلاسیزم لە ئەدەبیاتی کوردیدا ، نووسەر باوەری وایە گەرچی هەموو ئەو بەرهەمە شیعریانەی بەر لە سەدەی بیست نووسراون بە کلاسیك وەسف دەکرێن‌و کەم یا زۆر خاسیەتەکانی کلاسیزم دەیانگرێتەوە ، بەڵام تەنها لە سەدەی نۆزدەیەمدا ئەدەبی کلاسیکی کوردی وەك ڕیباز پێگەیشت‌و مەرج‌و دەستوورو یاساکانی ئەو قوتابخانەی تەواوکردن . [ گەرچی بەرهەمە ئەدەبیەکانی پێش سەدەی نۆزدەیەمیش بەشێکی گرنگ لە ئەدەبی کلاسیکی کورد پێك دەهێنن ] . ئەمەش لەبەر ئەوە بوو کە هەل‌و مەرجی بابەتیی‌و خۆیی بۆ سەرهەڵدان‌و پێگەیشتنی ئەو قوتابخانەیە تەواو فەراهەم کرابوون ، لە پێش هەموو ئەو هەل‌و مەرجانەوە بوونی میرنشینیەکی کوردیی سەر بەخۆ بوو .. لەژێر سایەی میرنشینی باباندا ژیانی کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و زانیاری‌و ڕوشنبیری کوردستان تا ڕادەیەکی زۆر پەرەی سەند . گەرچی بابانییەکان بنەماڵەیەکی ئەرستۆکراسی بوون‌و خۆپەرستی چینایەتی‌و ناکۆکی خێزانییان بەسەردا زاڵبوو ، بەڵام هەر لەو کاتیشدا یەکێك بوون لە ڕەسەنترین بنەماڵەکانی کوردستان‌و خاسیەتە هەرە بەرزو ڕەسەنەکانی گەلی کوردیان تێدا کۆ ببۆوە . ئەوان زۆر بە تەنگ ئەوەوە بوون میرنشینییەکەمان پێش‌بخەن‌و ناوبانگی بەرزی بڵاوبکەنەوە . نووسەر نموونەی چەند شیعرێکی سالم‌و کوردی‌و شێخ ڕەضای تالەبانی هێنایەوە ( وەك بەڵگەی پێشکەوتنی ژیانی شارستانی‌و بڵاوبوونەوەی ناوبانگی کوردو بابان‌و خۆش گوزەرانی کۆمەڵایەتی ) . بەڵام ئەم واقیعە بابەتییە، پێویستی بە عەبقەریەت‌و بەهرەیەکی خۆیی هەبوو کە تێی بگاو ڕۆحەکەی عەکس بکاتەوە ... واتە وەرچەرخانە مێژوویی‌یەکە دەست پێ‌بکا ، کە ئەویش بەکارهێنانی زمانی کوردی بوو وەك زمانی شیعر نووسین [ بێگومان زمانی کوردی بۆ شیعر وتن ( شیعری فولکلوری ) بەکار دەهێنراو نموونەی زۆر بە ڕزمان لەو شیعرانە هەیە ] .. ( نالی )ش ئەو بلیمەتە مەزنە بوو کە ئەسپی بەلاغەتی کوردی لە مەیدانی شیعری کلاسیکدا تاو دا .. لە ئەدەبیاتی کلاسیکی هەموو گەلاندا لاسایی کردنەوەو چاولێکردن هەیە .. بەڵام خاسیەتی سەرەکی‌و سەرەتایی ئەدەبیاتی کلاسیکی هەر نەتەوەیەك ، بەکارهێنانی زمانی نەتەوەیی‌یە ، وەك زمانی ئەدەب .. دوای ئەوەی نالی ( بە ئەنقەست ) خۆی خستە بەردەم ( ئەم ئیمتیحانەوەو ) تێی‌دا سەرکەوت ، سالم‌و

کوردیش ڕاستو چەپیان لێکرت .. زمانی کوردی بوو بەزمانی شیعرو جێگەی شانازی شاعیرانو شیعر دۆستان . حاجی قادریش ، قوتابخانەی شیعری کلاسیکی لەڕووی بیرو ناوەرۆکەوە کردە قوتابخانەیەکی نەتەوەیی‌و بەکارهێنانی زمانی کوردی کردە ئامانجێك ، خۆی لە خۆیدا .

جا ئێستا چۆن لەم ( شیعرە کلاسیکیە ) بکۆڵینەوە ، یان ( کلاسیکییە ) کەی جییەو چۆنە ؟

ڕوانگەی سەرەکی لێکۆڵینەوەکە ، سەیر کردنییەتی وەك بەشێك لە ئایدیۆلۆژیەتو ڕۆشنبیری باوی قۆناغی دەرەبەگایەتی کە بیری ئاینی ناوکەکەی پێك دێنێ . لێرەوە پێویستە کارتێکردنی دینی ئیسلام لەسەر تەواوی ئەدەبیاتی کلاسیکی ئیسلام تیك بدەینەوە .

١ – لەسەرەتاوە ئایینی ئیسلام بەگومانەوە سەیری شیعری دەکردو هانی نەدەدا .

٢ – ئیسلام ئەو شیعرەی دەویست کە لەگەڵ فەلسەفەی خۆی‌و ڕوانینی خۆی بۆ جیهاندا بگونجێ .

٣ – لەبەر ئەمە ڕوانگەی شیعری کلاسیکی بۆ جیهان ڕوانگەیەکی دینی‌و ( زۆر جار میسالی‌یە ) . کە شاعیر لەوە پێش هەیەتی‌و لێرەوە هەوڵ نادات جیهان بدۆزێتەوە ، حەقیقەتە کۆمەڵایەتییەکانی تێ بگا .

٤ – ئیسلام هانی ( گۆرانی ) شی نەدەداو ، لەگەڵ مۆسیقاو رەسمیش نێوانی نەبوو .. لەبەر ئەوە شیعر لە گۆرانی‌و بەتایبەتی لە ساماتی فۆلکلۆری جیا بۆوە .

٥ – شیعر زیاتر لایەنی [ زانیاری ] ( معرفی ) بە سەر دا زاڵ بوو ، واتە شاعیرەکان ( بەتایبەتی نالی ) یەکسەر زانیارییە دینیەکانیان وەك زانستی بەلاغەو نەحو ، مەنتیق‌و کەلامو تصوف .. هتد دەکردنە بابەتی شیعرو پشتیان بە تاقیکردنەوەی خۆیان لە ژیاندا نە دەبەست .

٦ – کۆمەڵێ یاساو ڕێوشوێنی هونەری دانرابوون کە دەبوو هەموو شاعیران پەیرەوی بکەن ، لەوانە پێوەندەکانی شیعری عەمودی‌و کێشی عەروزو یەك قافیەیی‌و پەیرەوی‌کردنی بەشەکانی بەلاغە [ بدیعو بەیانو معانی ] ، لێرەوە لاسایی کردنەوە زاڵ بوو .. لایەنی سەنعەت تەنگی بە شیعر هەڵچنی .

٧ – بۆیە لە ڕەخنەی عەرەبی‌دا ، وشەی داهێنان [ ابداع ] دەر نەکەوت ، بەڵکو لە جیاتی ئەوە وشەی زاندن [ تولید ] بەکار دەهێنرا ، واتە هەموو شاعیران هەر یەك [ وێنە ] یا « تەشبیە » بەکار دەهێنن بەڵام هەر یەکە بە شێوەیەکی کەمێك جیا لە ئەوی‌تر پێشکەشی دەکا .

٨ – لە ناو ئەو پێوەندانەدا شاعیری کلاسیکی تەنها دەبوو پشت بە بلیمەتی‌و توانای گەورەی داهێنانی خۆی ببەستێ .. بۆ ئەمەش هەردەبوو هەڵس‌وکەوت لەگەڵ زمان ( وشە ) دا بکا . بۆ سەلماندنی دەنگو رەنگی تایبەتی خۆی . ئەمەش شاعیرانی گەورەی وەك نالی ، سالم ، کوردی ، شێخ رەضا ، وەفایی ، حەریق ، مەحوی ، حەمدی.. بە توانایەکی گەورەوە کردوویانەو هەر یەکە رەنگێك یان سۆزێکی تایبەتی بۆ شیعرەکانی خۆی درووست کردووە .

٩ – زۆر جاریش شاعیری کلاسیکی لە ژیانی ڕۆژانەیدا تووشی تاقیکردنەوەیەکی واقیعی بەهێز دێت کە بەسەر پێوەندەکانی سنعەتدا زاڵ‌دەبێ‌و شاعیر جڵەو بۆ بەهرەو توانای ئەدەبی خۆی شل دەکاو شیعرەکانی رەوانو خۆکردو ( تەبع شێوە ) دەردەچن . سەدەها نموونەی شیعری خۆشەویستیمان لەم چەشنە هەیە .

١٠– سیفەتی زاڵی شیعری کلاسیکی سیفەتی نامۆیی‌یە . [ اغتراب ] لەبەر ئەو لێکدانەوەو ئیعتیباراتە دینی‌و ئایینی‌یەی کە شاعیر دەبێ لەوە پێش بیانگرێتە پێش چاوی‌خۆی. مەبەستمان لە ( ئیغتیراب ) ئەو مانایەیە کە [ فۆیرباخ ] بەکاری هێناوە و کە بریتییە لە هەموو جیابوونەوەیەکی مرۆڤ لە حەقیقەتی خۆی . شاعیری کلاسیکیش لە تاقیکردنەوەی ژیانی ڕۆژانەی خۆی‌و هەستو نەستی ڕاستەقینەی ناوەوەی خۆی دوور دەوەستێ‌و شتێ دەردەبڕێ کە لە ڕووی فیکری‌و هونەرییەوە لەوە پێش بەسەریدا سەپێنراوە ، و تەنانەت کە تاقیکردنەوەیەکی کۆمەڵایەتیشی هەبێ ، ناتوانێ تێی بگاتو ڕاستییەکەی دەشێوێنێ ..

**١١ــ لە شیعری کلاسیکیدا شێوە لە ناوەڕۆك جیا کراوەتەوەو .. شێوە تەنها وەك بەرگێکی جوان سەیر دەکا کە بکرێتە بەر ناوەڕۆکەکە ، یان وەك خشڵو ئارایشتێك کە لە دەرەوەڕا پێی برازێتەوە . بۆیە زۆر جار شێوە زاڵدەبێو یەکێتی شێوەو ناوەڕۆك لە لایەکەوەو ، یەکێتی ئۆرگانیو بابەتیی ، لەلایەکی ترەوە ، دروست نابێت .**

* * *

دوای تەواوبونی باسەکەی میراودەلی ئەدیبان کەوتنە دەربڕینی بیرو رای خۆیان بەرامبەر بە ناوەرۆکی ئەو باسە .

لەپێشا مامۆستا محمدی مەلا کەریم دەربارەی شیعرو ئیسلام دوا ، ئەوەی روون کردەوە کە ئیسلام دژی شیعر نەبوە ، بەڵام نەشیویستووە لە ئایدیای خۆی دەرچێ .

**بەڵام مامۆستا رؤف عثمان ئەم تێبینیانەی هەبوو :**

١ ــ کلاسیك بۆ چینی باڵا بووە .

٢ ــ زمان بەو شێوەیە نیە خاوەن باس لێی دوا، زمان هۆیە ، بەڵام کە خۆی بەست بەمەبەستێکی تایبەتیەوە ئەو کاتە دەبێتە ئامانج .

٣ ــ کاك کەمال باسی کێشو سەرواو پەیوەندی بە کێشی عەرەبیەوە نەکرد ، بەتایبەتی لە شیعرەکانی نالیو سالمو کوردیدا .

٤ ــ نالی شاعیری لەفزی نەبوە بە تەنیا بەلکو عەقلانیش بووە .

٥ ــ دەربارەی ئاین ئەگەر بلێین : تەنیا لە روی ئاینیەوە شاعیرانمان شیعریان وتوە ئەمە نارەوایە دەربارەیان ، چونکە هەستی نەتەوایەتی پێش ئەو هۆیە بووە .

٦ ــ خاوەن باس [ بەدیع ] و [ بەیان ]ی تێکەڵ کرد .

دوای ئەو نۆرە درابە دلشاد محمد ئەمینی شاعیر کە تێکرا چەند تێبینیەکی هەبوو ئەمانە پوختەکەیەتی :

**١ ــ وا دەرئەکەوێ کاك کەمال بە تەواوی شارەزای شیعری کلاسیکی کوردی نەبێ .**

**٢ ــ بەرای من ، پشتی بە دیوانەکەی نالی نەبەستوە ، رەنگە بە تەواویش ئەی خوێندبێتەوە چونکە پەنای بردە بەر وتەکانی ئەمین فەیزیو پیرەمێردو کەسانی تر .**

**٣ ــ پێناسینەکەشی دەربارەی کلاسیك برێتی بوو لەشتی گشتیو هیچی دی .**

**٤ ــ چۆن کاك کەمال دەڵێ : بیرو هۆشو ئەقل بەدەست چینەکانی سەرەوە بوون ، کەوا بێ ئەی چۆن کۆیلەکان توانیان شۆرش بکەن ، بە تایبەتی شۆرشی سپارتاکۆس .**

**٥ ــ لێرەدا لەگەڵ خاوەن باسدام کە لێکۆلەرەوەکانمان بایەخیان بە لایەنی فەلسەفی شاعیرەکانمان نەداوە .**

**دوا بە دوای کاك دلشاد مامۆستا کامەران موکری وتی :**

١ ــ من رام جیاوازە لەرای خاوەن باسو کەسانی دیش دەربارەی لێکدانەوەی کلاسیك .

٢ ــ هونەری [ بەلاغە ] سیفەتێکی تایبەتی نیە بە تەنیا بۆ کلاسیك دوای ئەم دو سەرنجە چەند بیروڕایەکی دیشی بە بۆ چوونی خۆی راست کردەوە دەربارەی دیاردەی شارستانێتی ، ئەمجا هەندێ کێشی شیعری یەکالا کردەوەو بەستی بە چەند نموونەیەکی شیعرییەوە .

لێرەدا جارێکی دی مامۆستا محمدی مەلا کەریم رێگای درایە کە هەندێ سەرنجی هەیە دەریان بڕی ، لە ئەنجاما وتی : ئەوەی کاك کەمال وتی دەربارەی دەسەلاتی چینەکانی سەرو ، وە کە فەلسەفەی باو فەلسەفەی چینی فەرمانڕەوا بوە ئەمە زۆر راستە ، بەڵام نابێ ئەوەیشمان لە بیر بچێ کە بەرامبەر بەوەش فەلسەفەی تایبەتیش لای زەحمەت کێشان ورەنجدەرانو ماف خوراوان هەبووە . لەبەر ئەوە هیچ ناکۆکیەك لەواتەکەی میراودەلیدا بەدی ناکەم ئەمجا دوای ئەم گفتوگۆیەی ئەدیبانو دەربڕینی سەرنجو تێبینی خۆیان مامۆستا کەمال میراودەلی وەڵامی دانەوە و وتی :

پێشەکی سوپاس بۆ هەموو ئەوانەی هەستانو تێبینیەکانیان بە نرخبوون :

١ ــ لە تێبینیەکەی کاکە حەمەوە دەست پێ ئەکەم ، رستەکەی دواییشی دەکەم بە سەرەتا کاك محمد وتی : ئاینی ئیسلام دژی شیعر نەبوە ، ئێمەش وامان نەوتوە ، وتمان دینی ئیسلامی بەگومانەوە سەیری شیعری ئەکرد ،

هەروەها وتی : [ فەلسەفەی باو فەلسەفەی چینی دەسەڵات دار بوە ] ، کە ئیسلام هات بیرێکی نوێ بوو ، گۆڕانێکی تازە بو لە ژیانا ، جا بۆیە ئەڵێم : لەسەرەتاوە ئیسلام ئەیوت ئەبێ شیعر هەبێ بەڵام ئەو شیعرەی کە خۆی سەرچاوەی بۆ دائەنێ ، واتە سەرچاوەکەی لە ئایدیولۆژیای ئیسلام وەربگرێ ، چونکە ئەو شیعرەی لە کۆنا هەبو تەمسیلی بیری چینی خاوەن بەرژەوەندی دەکرد ، وە ئیسلام تا ئەو رادەیە دژی دەبێ تا خۆی دەچەسپێنێ ئیدی لە دوایدا دژی نابێ .

٢ – وەزنەکانی خلیل لە دوایدا دانراوە ئەمە ناکرێ بیکەینە نیشانەیەکی کلاسیکی .

٣ – دەربارەی تێبینییەکەی کاك رۆف عوسمان کە ئەڵێ : بەرای من ئەدەبی عەبباسی ئەدەبی کلاسیکی نیە ، منیش لەگەڵ ئەو دام ، باسی ئەوەشم کرد کە پێشتر ئەدەب هەبووە ، وەکو ئەو وتی : شیعری عەمودی کە لە رووی شێوەوە زۆر خاسیەتو رێو شوێنی شیعری کلاسیکی تیایە ( هی جاهلی ) تاکیدم کردوە ئەڵێم: وەکو ناوەرۆك ، وەکو قوتابخانە ، مەبەسم ئەوەیە شیعری کلاسیکی کە وەکو ئێستا دروست بوە ، کە ئەتوانین ئێستا سیفەتەکانی یەك یەك بنووسین، خاسیەتەکانی دەربڕین ، لە چ کاتێکدا دروست بوە ؟ لەو کاتەدا کە ئەو خاسیەتانە خۆیان چەسپاند ، لە وانەیە شیعری جاهلی چەند « ظواهر »ێکی تێدا بێ لە رووی شێوەوە ، وەکو یەك قافیەیان هەبێ ، شێوەیەکی عەمودی بێتە خوارێ ، یەکیەتی بابەتی تیانیە ، ئەمانە بەشێکن لە شیعری کلاسیکی ، بەڵام ئەوانە چەند ظواهرێکنو نەبونەتە قاعیدە ، وە لەگەڵ فەلسەفەیەکی رەخنەیی مەنهجیدا تێکەڵ نەبوە ، جگەلەوە زۆر کەسیش گومان لە بوونی شیعری جاهلی دەکات ، فەترەی دوەمیش کە فەترەی ئیسلامە ئەتوانین تێیبگەین کە شیعر لە دەوری خولەفای راشیدینا لاواز بووە ، چونکە ئیسلام شیعری خۆی بنیات نە نابو ، وەنەشی ئەویست لەسەر ، رێو شوێنی جاهیلی شیعر بەردەوام بێ بەڵام لە قۆناغی ئەمەویدا تعارضەکە دەرکەوت « وا دەر ئەکەوێ هەندێ لە برادەران باش گوێیان لە باسەکە نەبووە ، بۆیە حەز دەکەم دوای بڵاوکردنەوەی باسەکە هەر رەخنەیەکیان بێ بە نووسین بڵاوی بکەنەوە » .

من وتم : کە دینی ئیسلامی هاتە ئاراوە لە روی غەزەلەوە ، فەلسەفەی ئایینی نوێ نە ئەبو غەزەلە ئیباحیە کۆنەبێ ، مرۆڤیش عاتیفەو هەستی هەیە ، ئەبێ عاتیفەو هەستی خۆی بەرامبەر بە جوانیو بە ئافرەت دەربڕێ ، ئەو واقیعە نوێیە کە صراعێکە لە نێوان مرۆڤو واقیعە کۆمەڵایەتیەکە ، وەئەو بیرەی لە مێشکیدایە ، وە ئەو غەریزەو ئارەزوەی دەیەوێ ئەمە سێ جۆر شیعری دروست کرد یەکیکیان شیعری تقلیدی کە باسی ئافرەت بە شێوەیەکی تقلیدی ئەکا ... مەرج نیە ئەوکەسە دڵداریشی هەبێ ، بەڵام شیعرەکەی بە غەزەل دەست پێ ئەکات ، لە واقیعە نوێیەکەدا دوو جۆر شیعری دڵداری دروست بوو ، یەکێکیان ئایین دەسەڵاتی هەبوو ، تەعویزی خۆشەویستیەکەیان بە شتێکی تر دەربڕیو لێرەوە شیعری تصوف پەیدا بوو ، شیعری تصوف باسی ئافرەت دەکات ، جوانی ، جوانی ئافرەتە ، لەش ، لەشی ئافرەتە ، چاو چاوی ئافرەتە ، بەڵام نموونەی جوانیەکە موتڵەقە ، کە نموونەی سوفێتییە ، ئەمەش لە شیعری مەحویدا زۆرە . جۆرێکی تریان شیعرێکی ئیباحی پەیدا بوەوە ، وە غەزەلی عوزریش دروست بوو کە « جمیل بثینە » پاڵەوانێکی بوو ، شاعیر ئینویەتی خۆی دەشکێنێ بەڵام بۆ مەبەستێکی پاك ، نەك بەمەبەسی « جنس » .

٤ – کاك رۆف عوسمان باسی زمانی کرد گوایا من وتومە « زمان لەخۆیدا ئامانجە » کاك دلشادیش ئەمەی دوبارە کردەوە ، ئەبێ لەم حالەدا بگەڕێینەوە دەقی باسەکە ، ئاخۆ من وام وتوە ؟ یا لەکوێدا وتومە ! من لەکاتێکدا وتوومە لە گواستنەوەی شیعر لە نالیەوە بۆ حاجی قادری کۆیی ، وتم : « لای حاجی قادر زمان بۆتە ئامانج، بێگومان ئێستاش لای نەتەوەی کورد زمان خۆی لە خۆیدا ئامانجە ، لە قۆناغێکدا دەبێتە ئامانج ، بەڵام لە قۆناغێکی ترا کە وەك یەك بژین ، چەوسێنەرو چەوساوە نەبێ بەهەر زمانی قسە بکەن قەی‌ناکا ، بۆیە راستە کە زمان لای حاجی قادر بوبوە ئامانج ، هەتا خۆی لە شیعرێکدا داوا لە شاعیرەکان دەکات کە هەر کەسێ زمانی خۆی نەزانێ حەرام زادەیە ، بۆیە دوبارەی دەکەمەوە کە لەو قۆناغەدا زمان ئامانج بووە ، وە تا قۆناغێکی زۆریش هەر بە ئامانج دەمێنێتەوە .

٥ – کاك رۆف عوسمان وتی : گوایا من وتومە لەبەر هەستی نەتەوایەتی سالمو نالیو کوردی شیعریان وتوە ، هەر خۆشی وتی : زمان

نامانج نیه ، من نموونەی هەستی نەتەوایەتی وتم : بیری نەتەوەیی گەلاله نە بوبو بەلام واقیعێ هەبو که زمانی کوردی لەو کاتەدا دەبو بەکار بهێنرێ چونکه فەرمانڕوایەکی کوردی هەبو ، بەلام کەی بو بە مەفهومی نەتەوەیی ؟ لای حاجی قادری کویی .

٦ ـ وتی : باسی کێشەکانی نەکردوە ، ئەم باسەی من ٢٠٠ لاپەرەیە لێرەدا تەنیا ٤٠ لاپەڕەم پێشکەش کرد وەك سەرەتایەك ، بەلام بەو مەرجەی دیوانی نالیم دەست بکەوێ !!

٧ ـ سوپاس بۆ کاك دلشاد کەوا دیارە هەولی نەداوە لەباسەکە بگات چونکە ئەو رۆنی خۆمی لەسەری خۆم دایەوە ، یەکێ لەو تێبینیانەی دەربارەی نالی‌و سالم من وتم : نالی ناقە سوارە نەبو لای راستی سالم‌و لای‌چەپی کوردی بو .

٨ ـ کاك دلشاد وتی : ئایا ئێمە کەسی ترمان پێش نالی نەبوە ؟ وتومە شاعیری دیکەی زۆرمان هەبوە بەلام هەر یەکەی لە ئەمارەتێ‌و هەریەکەش. بە شێوە زمانێ بوە ، وەکو شیعرە جاهلیەکە ظواهری کلاسیکی‌یان تیا بوە ، بەلام نەبۆتە قوتابخانەیەکی مەوزوعی ، چونکە ئەو زروفە مەوزوعی‌و زاتیە کەلە زەمانی بابانەکانا باسمان‌کرد لە شوێنەکانی ترا نەبوە ، ئەدەبی کلاسیکیش لە قۆناغێکدا دروست ئەبێ کە ژیانی کۆمەلایەتی پێش بکەوێ ، لەگەل ئەم پێشکەوتنەشدا زمانیش لەو چوارچێوەیە گەشە ئەکات لەبەر ئەوە لەو وەختەدا قۆناغی ئەدەبی کلاسیکی دروست بوو .

جگە لەمەش من ئەم ویستوە شیعرەکانی نالی شی بکەمەوە ، چونکە هەر لەسەر شیعرێکی کتێبێکی دەوێ شایەتیشم کتێبەکەی مامۆستا سجادی‌یە .

٩ ـ دەربارەی پەیوەندی نێوان چینەکانی سەرەوە ، بە داخەوە ئەویش برادەران باش تێ‌ی نەگەیشتون ، یان لەبەر وشکی باسەکە یان من بە پەلە خوێندومەتەوە ، من وتم : « چینی دەسەلاتدار حوکمی بیروراو هەلویستی خۆی هەیە » مامۆستا کامەران وتی : کەواێ مێژوو هەتا هەتایە نابێ پێش بکەوێ ، ئێمە وتومانە : چینی تازە لەو کۆمەلگایەدا پەیدا ئەبێ بەلام کە زروفی مەوزوعی هەبوو ، وەئەم شتانەش بە خەیال نابێ ، کاك دلشادیش وای پیشان دا کە من دژی نالی بوم بەلام وا نیە بەلکو من دەلێم :

پێویستە شی‌کردنەوەیەکی زانستیمان هەبێ‌و ئەقل بەکار بهێنین .

**رۆژی دوەم : سەر لە بەیانی .**

**ناونیشانی باس : مەحوی لوتکە لە کلاورۆژنەی شیعرەکانیەوە .**

**نوسەری باس : چیرۆك نووس مامۆستا عەبدوللا عەزیز خالد .**

**بەرێوەبەری کۆڕ : چیرۆکنووس مامۆستا رەئوف بێگەرد .**

دوای ئەوەی مامۆستا بێگەرد بە پێشەکیەکی ئەدەبیەوە رێگای بۆ باسەکە خۆش کرد، لە پاشان خاوەن باسی پێشکەش کرد کاك عەبدوللا لە باسەکەیدا وتی :

لێدوان‌و چوونە ناو دنیا بەرینەکەی ئەدەبی کلاسیکی کوردیەوە ماوەو دەرفەت‌و هەول‌و تەقەلایەکی بێ‌وچان‌و ئەفەس درێژی دەوێت بۆیە چاك وایە بۆ هەلدانەوەی پەرەی دێرینی ئەو ئەدەبەو ئاشنابوون پێ پێویستی بە رەنگ‌ڕشتنی نەخشەیەکی دیاری کراو سنوور بۆ کێشراو هەیە و بروا ناکەم هەروا سوك‌و ئاسان‌و بۆ موحازەریەکی

ئاوا مرۆڤ بتوانی بەل‌و پۆی بیروراو بۆچوونەکانی رووەو تێگرای لایەنەکانی ئەو ئەدەبەو ئەدیب‌و قوتابخانەیە بهاوێ .

هەر لەو رۆانگەیەوە دەمەوێ کەمێك تاسەی دووریمان بە ئاشنایەتی لەگەل قوتابخانەی ئەدەبی کلاسیکی و چونیەتی هەلکەوتنی ئەدیبە لوتکەکان‌و پەیدابکەین دوایش مەلی پەروش‌و تامەزرویمان لە هێلانەی دنیای شیعری مەحوی‌دا بحەوێنینەوە . .

لەبەر رۆشنائی لێکۆلینەوەو توێژینەوەی شارەزاو پسپۆرانی ئەدەبی کلاسیکی دەتوانین دەنگ و رازی لەرینەوەی ئەو تەلە ئاشکرا بکەین :

١ ـ ئەدەبی کلاسیك بەو ئەدەبە دێرینەی [ یۆنانی رومانی ] کۆن دەوترێ کە خاوەنی تایبەتی‌و سیمایی خۆیی خۆیەتی‌و هەل‌و مەرجی دیاری کراوی تیا دەبینرێ .

٢ ـ بەو ئەدەبە دەوترێ کە دوای شاکاری ئەدەبە دێرینەکەی ( یونان‌و رومانیا ) یان ئیغریقی کون لە دایك بوو ، وە ئەم جۆرە ئەدەبە پەیرەوی ئەوەی پێشو تری دەکرد واتا یەکەم لە پلەی داهێنان ، دووەم بە لاسایی

کەرەوە دا دەزێت . وا ئەزانم تەنیا لێدوان لەم لایەنەو بەستنەوەی بە ئەدەبی کوردیەوە دەست نیشان کردنو جۆری کار کردنە سەری ماوەیەکی زۆری دەوێت ، بۆیە ئەم چەند وشەیەم کرد بە پردی پەڕینەوەی باسەکەمو یەکسەر دێمە سەر ئەو راو بۆ چوونەی کە لوتکە هەرە هەڵکشاوەکانی دنیای ئەدەبو هونەرو زانستو تـ دوایی چۆن ئەو لەقەبەیان پێ براوەو ئاخۆ دەکرێ لە بارو دۆخی تایبەتیو ئاستی رۆشنبیری خۆ بە خیو کردن دابیڕیو تەنیا لە بەهرە زگماکیەکەدا خۆی بنوێنێ ؟! من پێم وایە تێکڕای بارو دۆخی سەردەمو رووداوە گرنگە مێژوویەکانیو ئاستی پلەی رۆشنبیری و کۆمەڵایەتیو ئابوری سەرەرای بەهرەو لیهاتوی مرۆڤ دەوری گرنگ دەبینێ ، هەر لە چەپەری ئەو چیەیەوە دەلێم : ئەو بارو دۆخ رووداوی سەردەمی هەرسێ حوکمرانی بابانو لەبار چوونی ئەمارەتە کوریەکەی رۆلیکی گەورەو گرنگیان لە لوتکەیی ( نالیو سالمو کوردی )دا بینوەو ئەمەو سەرەرای ئەو گورو گوژمە بەتین پەرە پیدانە خێراییەو گەشە پیدانە پیرۆزەی بە زمانی کوردی دراو لە جیاتی دیالیکتی گوران ( هەورای ) کرمانجی خوارو بەکارهێنرا دیارە من دەمەوی توند دەست لەسەر نوکی خامە داگرمو بێ شیل کردنی گەورەییو پایەی شیعری مەحویو شاعیر مافی رەوای لە لایەن هەندێ رۆشنبیرەوە ئاشکرا بکەم بەوەی وەك پێویستو شیاو خانەی لە ئەدەبەکەماندا دیاری نەکراو وەك بابەتیکی تەواو جیا لە هەرسێ کوچکەی بابان دەست نیشان نەکراوە ، من پێم وایە مەحوی شاعیر گەر لوتکەیەکی هەرە هەڵکشاو نەبیت لە شاعیرەکانی بەرو دوای خۆی کەمتر نەبووە ، خۆ گەر بە وردیو قولی بە دوو توێی شیعرەکانیدا بچینە خوارەوەو لە رووی شێوەی دارشتنی پتەو بە برشتو سفتو لە ناوەروکە پیرۆزەو بەرزەکەی بدوین ئەوا دەمو دەست لە رۆخی ئەو بیرورایەدا دەگیرسینەوە کە دنیای شیعری مەحوی تەواو تایبەتیو جیایە مە شاعیرانی بەر لە خۆیو لە قولیو وردە کاری سفتی دارشتنو چڕیو جۆرو هەمەواتایی ئەوا پێویستی بە مێشك گوشینو خۆماندو

کردنیکی زیرەکانەو هۆشمەندا نەیە بۆیە هەر لە ئێستاوە ئەوە دوپات دەکەمەوە ، ئەم سەرنجو بۆچوونانە لە خووی بیروڕای خۆم بەو لاوە ناترازێو ئەم باسەشم بە رووکردنەوەو یەك والآ کردنەوەی ئەو دنیایە دا دەنیم کە رووەو شیعرو شاعیرتی مەحوی مرۆڤ ماف بێ شیل کراو رابێچمان دەکاتو ئەم تەقەلایە بە هەڵزنانیکی بەلەی هەورازە قوچەکەیدا دادەنیمو ئەوراستیەش ئاشکرا دەکەمەوە کە لەم باسەمدا تەنیا لە لایەنیکی یەکجار بچوکی شیعرەکانی دەدوێمو هەوڵ دەدەم لەوێراوی شیعرەکانیەوە دەست نیشانی سەرەتای ژیانی شیعریو پێنانە دنیای سوفیەتو دوایش شیعرەکانی دوایی تمەنی دەست نیشان بکەم .... چاوخشاندنەوەیەکی تیژو خێرا بە تێکڕای شیعرەکانیدا ئەو ئاکامە سەرزەمات لا دیار ئەکات کە مەحوی شاعیر لە تمەنی سەرەتای هەرزەیی نەبوویێت یان ئەوەتا لە ساتیکدا تەواو لە رووی رۆشنبیری سەردەمو هۆشمەندیەوە پێگەیی بێتو خەملیبیتو بەلگەی نەبوونی کۆمەلە شیعری یان شیعریکی لاواز ئەو راستیە دەسەلمێنێ کە مەحوی وەك زۆربەی شاعیرانی بەر لە خۆی بەو قوناخەدا تینەپەری بێت من پێم وایە ئەو راستیە نیشانەو بەلگەی بەهرەو تواناو داهێنانی شیعری لای مەحوی شاعیر دەسەلمێنێ . حەزیش دەکەم ئەو راستیە بخەمە روو کە هەرگیز نامەوی لە سەر رووی راستی دەرخستنی شاعیریەتی مەحویو پلەو پایەو لوتکەی لە ئەدەبی کوریدا لە هێنانە خوارەوەی پایەی هیچ شاعیریکی دیبێت خوزگە دەیان شاعیری لوتکەو بەهرەدارو داهێنەری وەك ( مەحویو نالیو سالمو کوردیمان ) بوایە .

* * *

دوای تەواوبونی باسەکە دەستکرایە موناقەشەی باسەکە .

**لەسەرەتادا مامۆستا ئەحمەد سەلام پیرۆزبایی لە خاوەن باس کردو ئەمجا ئەم سەرنجانەی پیشاندا :**

١ ـ مامۆستا عەبدوللا گلەیی لەرەخنەگرو

لێکۆڵەرەوەکان کرد کە بایەخی تەواویان بە ( مەحوی ) نەداوە کەچی خۆشی دەربارەی ئەو لێکۆڵینەوانە هیچ نەدوا و سەبارەت بە ناوەرۆکی باسەکانیان هیچ رایەکی دەرنەبڕی .

٢ ـ گلەییشم لە جۆری خوێندنەوەی شیعرەکانی هەیە .

٣ ـ بۆچی نەچوبوە بنچو بناوانی مێژووی لە دایك بونی مەحوی‌یەوە واتە دەست نیشانی ساڵەکەی بەتەواوی نەکردبو .

٤ ـ بۆچی پەنجەی بۆ باسەکەی کاکەی فەللاح دەربارەی مەحوی ڕانەکێشا ئەمجا کاك ئەحمەد سەلام لە کۆتایی سەرنجەکانیا ڕێزو خۆشەویستی خۆی پێشکەش بەو دو هونەرمەندە کرد کە بە گۆرانی‌و ئاوازی خۆیان ڕۆڵێکی گرنگیان بینی لەپنیاسینی شیعری کلاسیکی‌دا بە تایبەتی شیعرەکانی مەحوی .

**دوای ئەویش مامۆستا کامەران موکری دڵخۆشی خۆی بەرامبەر بە باسەکە دەربڕی‌و وتی:**
جێی شانازیمە کە گوتم لە باسێك بێ دەربارەی مەحوی شاعیر لە لایەن یەکێ لە بنەماڵەکەوە کە ئەدیبەو قوتابیشە لە کولیجی ئەدەبیات ، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە من خۆم خۆشەویستیەکی تایبەتیم بەرامبەر بە شیعرەکانی مەحوی هەیە ، ئەمجا ئەم چەند ڕایەی دەربڕی :

١ ـ باسەکە بە لای منەوە پارچەیەك پەخشانی ڕازاوەی هونەری بوو .

٢ ـ هەندێ زاراوەی بەکار هێنا کە لە شوێنی خۆیانا نەبوون وەك مەسەلەی [ لوتکە ] و [ کلاورۆژنە ] .

٣ ـ بە ڕای من ڕەسەنێتی‌و هێزی دارشتن بەتەنیا سیفەتی تایبەتی کلاسیك نیە .

٤ ـ بۆچی لایەنی سۆفێتی مەحوی باس نەکردو چەند پەڕەیەکی بۆ ئەم لایەنە گرنگە تەرخان بوو .

دوای ئەم سەرنجانەی مامۆستا کامەران ئەمجا چەند شیعرێکی مەحوی خوێندەوە کە بۆ مەبەسی سۆفێتی وتویەتی وە لە کۆتاییشا وتی :

منیش لەگەڵ خاوەن باسدام کە لێکۆڵەرەوەکانمان وەك پێویست ئاوڕیان لەم کەڵە شاعیرە نەداوەتەوە .

**دوای ئەو مامۆستا محمدی مەلا کەریم وتی :**

١ ـ کاك عەبدوللا ویستی لە ڕێگای شی‌کردنەوەی شیعرەکانی مەحوی‌یەوە تەمەنی شیعری دەست نیشان بکات بەڵام بەلای منەوە ئەم جۆرە شێوازە لە باسا کردنا نامان گەیەنێتە مەبەست‌و ئەو سەرکەوتنەی ئەویستری بەدی نایەت .

٢ ـ بەڕاستی بۆ ساغ کردنەوەی شیعرەکانی مەحوی پێویستی بەتەقەللاو لێکۆڵینەوەو بە دوا گەڕانا هەیە ، جا لە کاتی خۆیدا دەربارەی ئەو دووباسەی مامۆستا سەجادی‌و کاکەی فەللاح کە سەبارەت لە مەحوی بڵاویان کردەوە من لە لای خۆمەوە کۆمەڵی سەرنجم بەرامبەریان هەبو ، وەلە پێشەکی دیوانی مەحوی‌دا بڵاوم کردەوە .

٣ ـ بەلای منەوە سۆفێتی لایەنی پرشنگداری شیعری مەحوی نیە وەك هەندێ لە برایان بۆی چوون .

٤ ـ منیش دوبارەی دەکەمەوە کە پێویستە بایەخ‌و گرنگی بە سامانی نەتەوەییمان بدرێ لەگەڵ دەست نیشان کردنی شوێن‌و جێگای هەر شاعیرە لە ڕوی بیرو باوەڕیەوە .

**لەدوای ئەویش مامۆستا ڕەئوف عوسمان کۆمەڵی ڕاو بۆچونی خۆی دەربڕی کە ئەمانەی خوارەوە پوختەیەتی :**

١ ـ ئایا بەرنامەی خاوەن باس لەسەر بەرنامەی سان بیر بوو ؟ یان ئا خۆ سەر بە چ قوتابخانەیەکی باس‌و لێکۆڵینەوە بوو ؟

٢ ـ بۆچی سوودی لە خاوەن باسەکانی تر وەرنەگرتبوو ، وەبەتەنیا متمانەی بەتەقەللای تایبەتی‌و بیروڕای خۆی کردبو ؟ بۆچی باسەکەی بەو سەرچاوانە دەوڵەمەندتر نەکردبو ؟ وەبۆ ئەوانەی خستبوە پشت گوێ ؟

٣ ـ بەلای منەوە کلاسیکی یۆنانی لە مەلحەمەوە دەستی پێ کرد نەك لە شیعرەوە .

٤ ـ دەربارەی ئەو دەستنیشان کردنەی خاوەن باس کە گلەیی لە دکتۆر عیززەدین مستەفا کرد کە لەنامەی دکتۆراکەیدا ناوی ( مەحوی ) نەبردوە لە ڕاستیدا ئەو گلەییە لە جێی خۆیدا نیە ، چونکە نامەکەی دکتۆر

لەسەر [ ریالیزم لە ئەدەبی کوردیدا ] بوو ، لەبەر ئەوەی مەحویش ناچێتە ئەم خانەیەوە بێ گومان کەوابێ ناوی لەوێدا ناهێنرێ .

٥ – شی کردنەوەکەی خاوەن باس دارشتن بوو ، لێکدانیشی روونو ئاشکرا نەبوو .

٦ – باسی ئەوانەشی نەکرد کە لە سۆفێتیدا کاریان کردۆتە سەر مەحوی لە دوای ئەم سەرنجانە ئەمجا مامۆستا رەئوف ئالانی دوو تێبینی پیشاندا :

١ – دەربارەی سۆفێتی لە هەورامانو دەشتی شارەزوورا .

٢ – دەربارەی بەکار هێنانی زمانی ئەدەبیی یەکگرتو لە لایەن شاعیرە کلاسیکییەکانەوە .

**لەپاشان ئەژی گۆرانی شاعیر پیرۆزبایییەکی گەرمی لە مامۆستا عەبدوللا کردو ستایشی باسەکەی کرد ئەمجا وتی :**

من زۆر سەرسامم لەوەی هەر کەسە هەڵ ئەسێ کۆمەڵێ رەخنە ئاراستەی باسەکان دەکات جا بۆیە منیش بۆم هەیە بپرسم : ئەی خۆیان بۆچی باسێکی تێرو تەسەڵو ئەکادیمیانەیان بۆ ئەم دیدارە ئامادە نەکرد ، لەدوایدا ئەم دووسەرنجەشی پیشاندا :

١ – ئێمە چونکە زمانێکی تایبەتی رەخنەکاریمان نیە بۆیە ناچار ئەبێ بکەوینە بەکارهێنانی زاراوەی هەندەران .

٢ – بەرای من کاك عەبدوللا فەرمانێکی بەکەمری دا کە ئەڵێ : ( مەحوی شیعری لاوازی نەبوە ) ، لەگەڵ ئەمەشا من ئەڵێم : مەحوی لەو قەسیدانەیدا بە ا ، و ، ی ، م ، ن کۆتاییان هاتوە لەوانەدا زۆر سەرکەوتو بوە .

**دوای تەواو بونی سەرنجی ئەدیبان ، خاوەنی باسەکە مامۆستا عەبدوللا عەزیز خالد سوپاسی هەمو ئەوبەڕێزانەی کرد کە رای خۆیان دەربارەی باسەکە دەربڕی ئەمجا وتی :**

١ – باسەکەم سەرەتایە بۆ چوونە دنیای شیعری شاعیرەوە ، لەم روەشەوە ئێستا خۆم بە بسپۆڕێ دانەناوە ، بەڵکو وەك وتم : سەرەتایەکە بۆ شڵەقاندنی گەلێ شتی گەورە .

٢ – لەبەر ئەوەی جیهانی شیعری [ مەحوی ] زۆر فراوانەو گەلێ پەلو پۆی لێ بۆتەوە ، وەبەگەڕان دەتوانرێ هەموو لایەنێکی بپشکنرێ بۆیە لەم باسەمدا بە تەنیا رووم لە لایەنێکی کردوە نەك هەموو لایەنە شیعرییەکان .

٣ – دەربارەی زاراوەی [ لوتکە ] و [ کلاورۆژنە ] کە مامۆستا کامەران لێی دوا ، دەمەوێ بڵێم پڕ بەپێستی ناونیشانەکەیە ، چونکە من وای دەبینم مەحوی وەك مرۆڤێكو شاعیرێکی پێ شێلکراو لە کونجو ژوورێکی تاریکدایە و ناچارم لە کلاورۆژنەوە سەیری ئەم شاعیرە لوتکەیە بکەم .

٤ – لە روی نەخشەکێشانو رەنگڕشتنی بەرنامەی باسەکەمەوە بە پێی بیروڕاو بۆ چوونی تایبەتی خۆم دەستم پێ کردوە .

٥ – زووربەی ئەو سەرنجانەی برادەران دووریان بڕی من لە لاپەڕە ٢٢ ، ٢٥ ، ٢٨ دا باسم کردون .

٦ – باس کردنی شاعیرێتی مەحوی وەك لوتکە وەنەبێ لە گەورەیی کەڵە شاعیرێکی وەك نالی کەم بکاتەوە ، بەڵکو مەبەستم ئەوە بوو شیعری مەحوی لە لوتکەییدا بابەتێکەو نالیش بابەتێکی تر لە گەڵ ڕەچاو کردنی بارو دۆخی ژیانو سەردەمی هەر دوو لا .

* * *

**چوارەم باس لەم دیدارەدا لە نوسینی مامۆستا مەسعود محمد و بە ناونیشانی « پایەی شیعری کوردی لە ئەدەبی کوردی سەدەی نۆزدەم » دا بوو ، مامۆستا سەباحی غالیب بۆ دانیشتوانی خوێندەوە .**

باسەکە بە بۆ چوونی کەمتر بو لەوەی چاوەروان دەکرا ، ئەمشێ لایەنی کاتو هەندێ شتی دی رەچاو کرا بێ بۆ چڕ کردنەوەی باسەکە . مامۆستا مەسعود محمد باسی پەیدا بوون و دامەزراندنی ئەدەبی نەتەوەیی لای نالیو هاوڕێیانی سەردەمی کرد ، هەروەها بە پوختەیی باسی دەوری فەرمانڕەوایی ئەورەحمان پاشای بابانی کرد لەگەڵ تیشك خستنە سەر ئەو دەورەی بوە هۆی گەشە کردنی ئەدەب ، بۆیە دەڵێم ، ئەم باسە ئەبێ سەرەتایەك بێ بۆ باسێکی فراوان تر .

**دوای خوێندنەوەی باسەکە ، مامۆستا**

ئەمەران چەند سەرنجێکی دەربارەی هەندێ وشەو زاراوەی نێو باسەکە پیشاندا لەوانە وتی :

دەبا بیوتایە نۆزدەیەم نەك نۆزدەم ، هەروەها نەدەبو ( هەڵبەست ) بۆ شیعر دابنێ ، جگە لەوەی کە وشەو زاراوەی عەرەبیش زۆر کەوتبو نەنێو باسەکەوە .

**ئەمجا مامۆستا کەریم شارەزا وتی :**

« - وام هەست پێ کرد کە مامۆستا مەسعود زۆر تر لایەنی شیعری باس کردو بە لای پەخشاندا نەچو ئەمە لە کاتێکدا باپیری مامۆستا ( مەولود نامە ) یەکی بە پەخشان نوسیبوو بەڵام پەخشانی سەروادار » .

**حەسیب قەرەداخی شاعیر وتی :**

بەرای من کە باسی شیعری کلاسیکی ئەکرێ ئەبێ کێش‌و سەروا رەچاو بکرێ ، چونکە من وام هەست پێ‌کرد کە خاوەن باسەکان ئەم لایەنەیان پشت گوێ خستبوو ، جا بۆیە چاوەروان بوم کە تینویەتیم لەم لایەنەوە بە باسەکەی مامۆستا مەسعود بشکێ ، بەڵام بەداخەوە ئاواتەکەم نەهاتە دی .

**لە پاشا مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم وتی :**

لای من وایە کە باسەکە تەواوو تێرو تەسەلە ، لەروی ئەو تێبینی‌یەی مامۆستا شارەزاشەوە ئەڵێم : خاوەن باس لەو رایە دایە کە پەخشان وەك دیاردەیەك لە ئەدەبی کوردیدا ئەو سەردە مەسەری وەك شیعر هەڵ نەدابوو

ئەمجا لە کۆتاییدا مامۆستا سەباحی غالیب سوپاس ئەو برادەرانەی کردو وتی : بریا رێگای ئەوەم ببایە کە لە بری خاوەن باس وەڵا بدەمەوە بەڵام هەر چۆنی بێ ئەو چەند تێبینی‌یەی دەڵێم :

**١ - باسەکە هەمو لقەکانی ئەدەبی گرتبوە خۆی .**

**٢ - ناز ناو رۆڵێکی گرنگی بوە لە پاراستنی ئەمو سامانە شیعری‌یەی لە بەردەستمانایە ، هەر وەك مامۆستا مەسعود وتویەتی .**

**٣ - بۆ وەڵامی کاك حەسیب دەڵێم : ئەم باسە دەربارەی پایەی شیعرە لە سەدەی نۆزدەیەمدا نەك دەربارەی کلاسیکیە .**

* * *

**پێنجەم باس : رەمزی سۆفیێتی لای شاعیرانی ناوچەی بادینان .**

خاوەنی باس : **دکتۆر نافیع ئاکرەیی .**

**بەرێوەبەری کۆڕ : کاك حەمە سەعید حەمە کەریم .**

بەو ناونیشانەی سەرەوە دکتور ئاکرەیی باسێکی خۆشی بەشێوە زمانی کرمانجی خوارو پێشکەش کرد . باسی ئەو رەمزە سوفیێتی‌یانەی کرد کە لای شاعیرانی ناوچەی بادینان بوە ، وەگەلی نموونە شیعری جوانی لەم روەوە خوێندەوە . سەرەرای ئەوەی کە باسەکە بە کەڵك بو ، گەلێك بەهارات‌و ترش‌و خوێتی بۆ وەرز نەبونی دانیشتوان پێوە دەکرد لە دوای تەواو بونی خوێندنەوەی باسەکە مامۆستا کەریم شارەزا بەرپەرچی خاوەن باسی دەربارەی ناوی بادینان دایەوە ، کە گوایا بریتی‌یە لە ( بە ) واتە چاك‌و ( دین ) واتە ئایین .

هەروەها وتی : زوربەی ئەو شاعیرانەی ئەو نێوی هێناون شاعیرانی بۆتان بوون کەواتە دەبا بیوتایە [ شاعیرانی کوردستانی ژوروو ] ئەمجا وتی : بە لای منەوە کە شاعیرێ ناوی ئافرەت دەبا ، هەر بەراستی مەبەسی ئافرەتە . چونکە رەمزە بۆ جوانی‌و خۆشەویستی نەك رەمزە بۆ سۆفیێتی .

لە دوای مامۆستا شارەزا ، مامۆستا ئەحمەد سەلام پیرۆز بایی لە دکتۆر نافیع کرد ، دەربارەی باسەکەی ، لەپاشا پێشنیازی ئەوەی کرد کە دکتۆر شۆ لەدوای لێکولینەوەی باسەکەی دکتۆر نافیع چەند شیعرێکی هەڵبژاردەی خۆی بخوێنێتەوە ، پێشنیازەکە پەسندکرا .

ئەمجا مامۆستا ئەحمەد هەردی زۆر بە گەرمەوە پیرۆزبایی لە دکتور کردو سوپاسی کرد بۆ ئەو تەقەللایەی بۆ ئامادەکردنی باسەکەی داویەتی لە دواییدا چەند سەرنجێکی پیشاندا :

١ - شیعرەکان نموونەی شیعری شاعیرانی بۆتان بون لەبەر ئەوە ئەبو دکتور باسەکەی ناوبنایە شاعیرانی کوردستانی ژورو .

٢ - من بە پێچەوانەی رای مامۆستا شارەزاوە ئەڵێم : ئافرەت رەمزە لە شیعری سوفیێتی‌دا ، وە لێرەدا رای دکتۆر نافع بەلامەوە جێی خۆیەتی .

« بۆ سەلماندنی ئەو رایەش بەیتێکی حافزی شیرازی خوێندەوە » .

٣ - زۆر بەختەوەرم کە ئەم باسەم لەم دیدارەدا

گوێلێبوو ، که گەلێك ڕەمزی پێناساندیە ، ئەم ڕەمزانە ـ ئەگەر سەیری دیوانی شاعیرەکانمان بکەین لای بیخودو شاعیرانی تریش هەن . .

٤ ـ هەروەها مامۆستا هەردی باسی یەکیەتی بوونی کردوە بۆ سەلماندنی واتەکەی شیعری شێخ محیی الدینی عەرەبیو پیرەمێردی بە نموونە هێنایەوە دوای مامۆستا هەردی ، ئەژی گۆرانی شاعیر پیرۆزبایی لە دکتۆر نافع کردو وتی :

« ڕەمز لە شیعرا ئەنجامی چالاکیەکی غەریزیی‌یە لای مرۆڤ ، لەبەرئەوە ئەپرسم بۆچی خاوەن باس هەڵویستی خۆی بەرامبەر بە ڕەمز لە شیعرا ڕووننەکردەوە ؟ » .

**ئەمجا مامۆستا ڕەئوف عوسمان پاش دەربڕینی ڕێزی بەرامبەر بە دکتۆرو پەسندکردنی باسەکە ئەم تێبینی‌یانەی باس‌کرد :**

١ ـ شیعری کلاسیکی زاڵبوونی ئەقڵو کۆمەڵی ( قیەمە ) لەبەرئەوە نابێ ئەدەبی سۆفێتی بە کلاسیك دابنرێ بەڵکو لە ڕومانسیەتەوە نزیکترە .

٢ ـ ئەبو دکتور نافع کەمێ باسی سەرەتاو پەیدابوونی سوفێتی بکردایە بۆ چونە ناو باسەکەیەوە .

٣ ـ بەرنامەکەی « تەفسیری » بو نەك «تحلیلی» ئەوەی پێویستیشە لە باسێکی وادا دەبو بەرنامەی شیکردنەوە ( تحلیلی ) بەکاربهێنرێ .

٤ ـ سۆفێتی بەرهەمی بیری چینێکە بۆ پەنجەی بۆ ئەم مەسەلەیە ڕانەکێشا ؟

٥ ـ دەبو ڕووی لێكچوون لە نێوان مەلای جەزیریو جلال الدینی رومی‌دا باس‌بکات .

**دوای ئەویش مامۆستا محمدی مەلا کەریم لەم تێبینی‌یانەی خوارەوەدا بیروڕای خۆی بەرامبەر بە ناوەڕۆکی باسەکە پیشاندا :**

١ ـ دەبو ناونیشانی باسەکە « چەند نموونەیەك لە ئەدەبی سۆفێتی ناوچەی بادینان » بوایە .

٢ ـ وام چاوەڕوان‌دەکرد لەم باسەدا بنچینەی سۆفێتیو خاسیەتەکانیو ئەدەبی سوفێتیو بە ئەنجام هێنانی باس‌بکرایە .

٣ ـ ئەدەبی سوفێتی بریتی‌یە لە کۆمەڵی خواستن لەگەڵ تێبینی بەکارهێنانی ڕاناوی نێرینە نەك مێینە .

٤ ـ عیشق لای سوفیزمەکان عیشقێکی ڕاستەقینەیە نەك « مەجازی » .

٥ ـ لەبنەرەتا فیکرەی سوفێتی لە خۆیا دەیەوێ پایەی خۆشەویستی بەرز بکاتەوەو بیگەیەنێتە پلەیەکی بەرز .

ئەمجا یەکێ لە ئەدەب دۆستان کە ناوی کاك کاوە شفیق بوو ڕەخنەی لە کاك حەمە سەعید حەمە کەریم گرت کە گوایا لە باتی بڵێ : شێوە زمان وتویەتی ( زمان ) ، کاك حەمە سەعیدیش وەڵامی دایەوە کە هەڵەی وای نەکردوە .

**دوایی دکتور جمال رشید مامۆستای مێژوو لە کۆلیجی ئەدەبیات باسی یەکیەتی بوونی کرد ، پاشا چوە سەر ناوی ( بادینان )و ئەو ڕا جۆراو جۆرەی لەسەر ناوەکە هەیە ، هەروەها وتی :**

بەدینان مەزەبێکی ئایینی کۆن بو بەڵام دوای هاتنی ئیسلام ناوەکە گۆڕا ، وە لە بری ئایینی بۆ بە جوغرافی .

ئەمجا وتی : سوفێتی وەك لە مامۆستا محمدی مەلا کەریم گەیشتم بە دیاردەیەکی ڕۆژهەڵاتی دانا بەڵام خۆی فیلەسوفیای یۆنانیە واتا پیاو چاك ، هەروەها دکتور جمال وتی : سۆفێتی لە سەدەی حەوتەمی پێش زایینا لە یۆنان هەبو ، تەنانەت لە سەدەی پێنجەمی پێش زایینا کە سوقرات بە دوای حەقیقەتدا دەگەڕا ، وە شێوازی بیرکردنەوەی جیاوازبو لە شێوازی بیرکردنەوەی خەڵکی ئەسینا .

**دوا بە دوای دکتور جمال ڕەشید ، خوشکە « تمنیا غەفور » ڕووی‌کردە خاوەن باس‌و لێی پرسی :**

مامۆستا ئێوە وتتان ئافرەت ڕەمزبوو بۆ جوانیو ڕەمزیش‌بو بۆ ( جنس ) بە درێژی باسی لایەنێ یەکەمتان کرد بێ‌ئەوەی خۆتان لە قەرەی لایەنی دوەم بدەن ، ئەم ڕاکردنە بۆ ؟

**دکتور نافع لە وەڵاما وتی : کچم ئەوێرام :**

ئەمجا مامۆستا کەریم زەند دەربارەی سۆفێتیو لە ناوچوونی لە کوردستاناو بوژاندنەوە لەسەر دەستی مەولانا خالیدی نەقشبەندیدا دوا **پاشان مامۆستا کەمال میراودەلی چەند تێبینیەکی خستە ڕوو لەوانە :**

١ ـ باسەکانمان لە ڕووی مەنهجیەتەوە جێی

گلەیە .

٢ – سۆفیتی بڕوای بەوەیە کە لەم دونیایەدا حەقیقەت نیە بەڵکو حەقیقەت لەو دونیایەدایە کە خۆشمان دەوێ‌و دەمانەوێ‌و بۆی دەگەڕێین ، ڕێگای گەیشتن بەو حەقیقەتەش دۆزینەوەی تیشکێکی پرشنگداری خۆیە .

★ ★ ★

## سێیەم ڕۆژی میوانداریتی ئەدیبان لەسەر خوانی شاعیرانی کلاسیک

**شەشەمین باس : شیعری کوردی‌و زاراوەی کلاسیزم لە ئەوروپا .**

**نوسەری باس : دکتور کامل بەسیر .**

**بەڕێوەبەری کۆڕ : دکتۆرە کوردستانی موکریانی .**

دکتور کامل باسی شێوازەی خوازەی بۆ پێناسەی زاراوە کرد ، هەروەها لە سەرەتاو مێژووی پەیدابونی زاراوەی کلاسیزم دوا ، وە دەستنیشانی ئەوەی کرد کە بەکارهێنانی کلاسیك هەڵەیەو ، وشەی ( ك ) بە زیادە خراوەتە سەری ، چونکە خۆی بریتی‌یە لە کلاس + ی .

لە دوایدا وتی نالی نەیویستوە خۆی بە شاعیرانی ترەوە ببەستێ‌و خۆشی بە حەریفی کەس نەزانیوە ، هەروەها حاجی قادری کۆیی خۆی وەسفی شیعرەکانی خۆی‌کردوە .

لە دوای ئەمانە دکتور هاتە سەر مەسەلەی لاسایی لە ڕەخنەسازی‌دا وە لە ئەنجاما هاتە سەر ئەو ڕایەی کە کلاسیك لە شیعری کوردیدا نیە وە ئەوەی هەیە پێی دەوترێ : شیعری دێرین یان شیعری پێشین . وە بۆ چەسپاندنی ئەم ڕایەش ئەم تێبینی‌یانەی باس‌کرد .

★ مەسەلەی قوتابخانەو ڕێباز کە بەردی بناغەی کلاسیزمە لەگەڵ سروشتی هۆنراوەی کوردیدا ناگونجێ وە ئەو شاعیرانەشمان ناچنە چوارچێوەی کلاسی‌یەوە .

★ کلاسیزمی ئەوروپی لەسەر بناغەی کتێبەکەی ئەرستۆ دانراوە کە چۆن هۆنراوەی تیاشی دەکاتەوە .

★ لوتکە لای ئەرستۆ یان ترازیدیایە یان کۆمیدیا .

★ دولبەرەکان سەرچاوەی ئیلهامی شاعیرە کوردەکان بون .

★ هۆنراوەی ئەوروپی کلاسیزم شیعری ویژدانی تیا نەبوە ؛ شیعری شانۆیی‌بوەو بە کۆت‌و زنجیری ڕەخنەسازیەوە بەستراوەتەوە .

★ میراتی نەتەوایەتی کوردی ؛ شیعری شانۆیی بۆ بەجێ‌نەهێشتوین .

★ شێوازی هۆنراوەی کورد پشت بە خەیاڵ نەبەستێ بۆیە لەگەڵ کلاسیزمی ئەوروپیدا ناگونجێ .

★ نەشیان ویستوە جگە لە کوردی شیعریان بێ .

★ بە داخەوە مێژووی شیعری کوردی بە شێوەیەکی زانستانە ، نەنوسراوەتەوە دوای تەواوبونی باسەکەی دکتور کامل ، دکتورە کوردستان شیعرێکی نالی خوێندەوە ئەمجا ڕێگای بە دانیشتوان دا کە موناقەشەی باسەکە بکەن لە پێشا دکتور نافع ئاکرەیی وتی :

نالی وتویەتی من ارتباطم بە کەسەوە نەبوە ؛ لەم ڕوەوە مەلای جەزیریش پێشتر بۆ شانازی‌کردن بە شیعرەکانیەوە هەمان شتی وتوە .

**بەڵام مامۆستا محمدی مەلا کەریم وتی :**

★ باشت لە دەرەوە نەخوازین ، واتە زاراوەیەکی نوێ دابنێین نەك بۆ هەر کلاسیك .

★ دومێکە زاراوەی کلاسیك هاتۆتە ڕۆژهەڵاتەوە ؛ لەوەش دەرچوە هەر بۆ شانۆ بوبێ گەلێ مانای تریشی‌بوە .

★ شانازی کردنی نالی بە شیعرەکانیەوە ئەو بەلگەیە نیە کە دکتور کامل پشتی پێ‌بەستوە بەلکو ئەوە نیشانەی شانازی‌کردنە بە هونەرەکەیەوە .

★ با ئێمە لەوە بگەڕێیە کە بزانین کلاسیك لە مفهومی مەسرەحی دەرچوە بەڵام با ئەوەیان دەستنیشان بکەین کە مواسەفاتی کلاسیك لای ئێمە لە شیعری کێدا ئەبینرێ .

★ دوای ئەویش دکتور ئیبراهیمی عەزیز دەربارەی گیروگرفتی زاراوە دواو وتی : ئێمە زاراوەیەکی وامان نیە جێی کلاسی

بگرێتەوە .

هەروەها رەخنەشی لـــە دکتور کامل گرت دەربارەی بەکارهێنانی زاراوەی ( رەخنە سازی ) وە وتی : « ئەمە لەسەر کێشی داسازییە » .

**ئەمجا مامۆستا رەئوفی ئەحمەد ئالانی بـــە گێرانەوەی روداوێکی مزگەوتی شێخ سەلام لـــە ساڵی ١٩٥٦ دا سەری قســەکانی دەستپێکردو چەنــد تێبینییەکی زمــانــەوانی خســـــتەروو لەوانە وتی :**

مـــــــتومرو دەمــەتەقێو دەمەقاڵێ بۆ موناقەشـــە دەســـتنادات چاکتر وایە بڵێین : چەندو چۆن .

هەروەها وتی : دکتور کامل لەباســـەکەیدا وتی : زاراوە گیــان لــەبەرێکی زینــدوە دەبوایــە بیوتایە : زیندەیە .

**ئەمجا رووشیکردە دکتور کوردستان وتی :** بەلای منەوە نابێ نێو بۆ ( اســـم ) بەکاربهێنرێ ئەبێ نێو بۆ ( ظرف ) بێو ( ناو ) یش بۆ ( اسم ) .

**لە دوای ئەویش مامۆستا سـەباحی غالیب وتی :** جاران کە قوتابی بوم مامۆستام دکتور کامل بە سنگێکی فراوانەوە هەمیشە رێگای موناقەشـەی ئەدام ئێستاش هەر بەو نیازەو ئەم چەند تێبینییە دەرئەبڕم .

★ دکتور کامل کە شتێکی بوێ بڕیاری لەسەر دەداو دەڵێ : دەیچەسپێنم راســـتیەکەی ئەدەبا ئەو فەرمانە دەرکات دەبو بڵێ : من پێشنیازوەکەم یان وام پێباشە ..... تا..د

★ لاسایی کردنەوە نابێتە هۆی پێشــــکەوتنی ئەدەب . بەڵام شت وەرگرتن لە میلەتانی دی نابێ بە لاساییکردنەوەی کوێرانە .

★ دکتور کامل وتی : شـــاعیرانی کۆنی کورد کلاسییان نەزانیوە بۆیە دروست نیە ئێستا ئەم زاراوەیەیان بەسەرا بسەپێنین جا کـە واتـــە منیش بۆم هــەیــە بڵێم : ئەی خۆ شـــــاعیرانی کۆن پێش خلیل عەروزیان نەئەزانی . کەچی شیعرەکانیان عەروزیشن .

★ د. کامل دەیەوێ کۆمــەڵێ زاراوە بهێنێتە نێو ئەدەبەوە . هـــەر لە کۆنەوە لای ئێمە ( رەخنە ) باوبوە وا ئێستا دکتور کامـــل دەیەوێ بیکا بە رەخنەسازی دوا بە دوای کاك سەباح مامۆســـــتا کامــەران موکری پیرۆزبایی لـــە دکتور کامـــل کردو وتی : باسەکەی ئەکادیمی بو ، وە سوودبوو ، لە پاشانا وتی : جێی خۆیەتی وەك دکتـــور دەڵێ : با لە بری کلاسی بڵێیە : هۆنراوەی پێشین یان دێرین لە دوایدا پرسی : ئاخۆ چ چەشنە هۆنراوەیەك کلاسیەو چ جۆرێکی رۆمانسیە ؟

**ئەمجا مامۆســـتا ئەژی گوران دەربارەی رەخنەو سەرەتاو دەستپێکردنی لە شێخ نوری شێخ صالحو ئەمجا رفیق حیلمیو تا سەرهەڵدانی روانگە دوا ، وە لـە پاشـــا هـەندێ تێبینی زمانەوانی لەســەرباسەکەی دکتور کامل پیشاندا لە وانە وشــەی ( چەش ) کە دکتور بۆ ( چێژ )ی دانابوو .**

هەروەهــا باسی بەخشینو وەرگرتنی کردو وتی : ئەمە ئەنگی نیــە بـەڵـکو هەمــو ئـەدەبێ پێویستی بە وەرگرتن هەیە وەك پێویســـــتە بەخشینیشی هەبێ .

**دوای ئەویش مامۆســـــتا کاکەی فەللاح پیرۆزبایی لە دکتور کاملکردو وتی :**

★ مەفهومی کلاسی تەنیا ئەوە نیە کــە دکتور باسیکرد بەڵکو مەفهومی لاســایی هەیە ، مەفهومی چەسپاوو نەگۆڕی هەیە ، ئەمەش بەســەر ئەدەبی کوردیدا تطبیق دەبێ وەك ( قیەمی نەگۆڕ ) .

ئەمجا وتی : با بزانین ئاخۆ ئەو نیشـــانانــە چین کە ئێمە خاوەنی قیەمی نەگۆڕین :

١ ـ قەصــــیدەی عەمودی شــتی باوبوە لای شاعیرانی کلاسی .
٢ ـ کێشی عەروزی هەبوە .
٣ ـ غەزەل لە حەوت بیت نابێ زیاتربێ .
٤ ـ یەکیەتی بابەت پەیڕەو نەکراوە .
٥ ـ دیوانەکان چاودێری پیتی هجایانکردوە .
٦ ـ هەوڵیان داوە هەموو بەحرەکان بگرنەوە .
٧ ـ وشەی عەرەبیو فارسییان بەکارهێناوە .
٨ ـ بایەخیان بە سنعەتو بەلاغەت داوە .
٩ ـ فەرهەنگی کلاسییان بوە .
١٠ـ بایەخیان بە موبالەغەو شـــانازی بە خۆوە کردنەوە داوە .
١١ـ هەجو ، شیوەن لە شیعرەکانیانابوە .
١٢ـ گرنگییان بە دارشتن داوە .
١٣ـ نازناویان بۆ خۆیان داناوە .

**دوای مامۆستا کاکەی فەللاح ، مامۆســـتا**

**کەمال میراوودەلی بە دوورودرێژی لەسەر باسەکەی دکتور کامل دوا**، مەفهومی زاراوەو چۆنیەتی وەرگرتنی لێکدایەوە وتی : ئێمە ناتوانین هەمو زاراوەیەك دروستبکەین ، بەڵام پێویستی وای لێ کردوین هەندێ زاراوە ، وەك مەفهومی ئینسانی بەکاربهێنین .

ئەمجا وتی : بناغەی زانستی گریكو رۆمانە ، ئێمە بۆچی پێویستمان بە زانستەکانیانە بەڵام دەبێ پێویستمان زاراوەکانیان نەبێ .

هەروەها لەم روەوە ئەوەشی روون کردەوە کە کاتێ خۆی ئەدیبە عەرەبەکان ویستیان جێگرێ بۆ کلاسیك دابنێن بە ناچاری بوون بە ناچاری بوون بە سێ بەشەوە هەندیکیان پێیان دەوت : مەزهەبی اتباعی ، هەندێکی دیکە دەیانگوت : مەزهەبی تەقلیدی بەشی سێیەمیش پێیان دەوت : شێوازی کۆن ، بەڵام هەرسێ لا خۆیان رانەگرتو لە ئەنجاما گەڕانەوە سەر بەکارهێنانی ( کلاسیك ) .

لێرەدا بە درێژی باسی کلاسیكو پەیدابونیو ئەسلی وشەی ( کلاسیکوس )ی کرد سەرەرای ئەوانەش ئەم سرنجانەی پیشاندا :

١ – ئەو بەیتانەی نالیو حاجی قادر کە دکتۆر بە بەڵگە هێنانیەوە نابنە بریارێکی مێژوویی جێگر ، چونکە ئەو بەیتانە بۆ شانازییە .

٢ – هیچ ئەدەبێ لە خۆیەوە دروستنابێ تا کاری دەرو دراوسێی نەکرابێتە سەر .

٣ – نالی بە بلیمەتیو هەڵکەوتویی خۆی تێپەڕی کرد .

٤ – لاسایی کردنەوە ( موحاکاتە )و تأسیرە ، بەڵام ( تأسیر ) و ( تأسر ) جودان وە ئەمە جیاوازیشە لە دزی ئەدەبیو لە (تولید) .

لە کۆتایی تیبینیەکانیا میراودەلی دەربارەی بیر دواو وتی : لەو سەردەمەدا بیری زال بیری ئاینیبوە .

ئەمجا وتی : بۆ جیاکردنەوەی کلاسی کوردی دەبی دراسەی کلاسی ئیسلامیو ئەوروپیش بکەین .

لە کاتی گفتوگۆو دەربڕینی راو سرنجەکانی ئەدیبانا دکتور کامل ناو بە ناو بە نوکتەو قسەی خۆش وەڵامی ئەدانەوە ، لە کۆتاییشدا ئەم چەند وەڵامەی هەبوو :

١ – لاسایی جیایە لە کارتێکردن . بەڵام سوود وەرگرتن ( تآثیر و تآثر ) رەوایە .

٢ – وەرگرتنی زاراوەی شارستانێتی ئەمە جێگای موناقەشەیەکی تایبەتیە. بەڵام بۆ زاراوەی رۆشنبیری من بە هیچ جۆرێ نامجولێنێ .

٣ – دەبوایە باسێك بۆ شیکردنەوەی شیعرەکانی شاعیرانی دێرین لەم دیدارەدا بە تایبەتی ببوایە .

٤ – ئەو مواسەفاتەی کاکەی فەللاح باسیکردن بە پێی زانست لەگەڵ مواسەفاتی کلاسیزما ناگونجێن .

بەمجۆرەش دانیشتنی سەر لە بەیانی پێنج شەممەی ١٦/٤/١٩٨١ یش کۆتایی هات .

* * *

**سەعات سێو نیوی پاش نیوەرۆی پێنج شەممە هۆلی فارابی جارێکی کەش پێشوازی ئەدیبانو روناکبیرانیکرد ، دوا باس لەم دیدارەدا بەم ناونیشانە بو [ گیروگرفتەکانی ریگای راستکردنەوەو لێکدانەوەی ئەدەبی کلاسیکی کوردی ] کە مامۆستا محمدی مەلا کەریم بۆ ئەم دیدارەی ئامادەکردبوو .**

سەرەتا نوسەری ئەم گەشتە ، خاوەن باسی پێشکەشکرد ئەمجا ئەویش لە باسەکەیدا وتی : ژمارەیەکی باش لە رۆشنبیرانمان رویانکردۆتە بە دوای ئەدەبی کلاسیكو ساغ کردنەوەو بڵاوکردنەوەیدا ؛ ئەمەش بەڵگەی خۆدۆزینەوەو پێکەوە بەستنی ئێستاو رابوردوە لە ناو کوردا ، ئەدەبی کلاسیکمان بەشی فولکلۆرەکەی لێدەرکەی تەنیا ئەو پارچە شیعرانەیە کە لەم دیوانو لەو کەشکۆڵ نوسراونەتەوە ، لای هەندێ مەلاو لە حوجرەو مزگەوتو لە کتێبخانەی هەندی ماڵە گەورەدا ، یان لە هەندێ لە کتێبخانەکانی وڵاتانی دەرەوەدا پارێزراون .

ئەمجا مامۆستا محمد مەترسیانەی خستەروو دەربارەی فەوتاندنی ئەم سامانە نەتەوەییە ، وە پێشنیازیکرد کە هەوڵبدرێ هەرچی ماوە لەمجۆرە ئەدەبە بە زوویی بڵاوبکرێنەوەو لە فەوتاندن رزگاربکرێن لە پاشا وتی : بهایەخی کەلەپور تەنیا لە رووی ناوەرۆکەوە نیە ، مەسەلەی زمانو زمانەوانیش لە ئارادایە ، ژیانی کۆمەڵایەتیو گەلیك شتیتر بە بەراوردکردنی تێکستەکان رێگای هەڵوراندنمان دەستنیشان ئەکات .

هەرودها رەخنەی لە هەندێ لەو کارانە

گرت کە لەم ساڵانەی دواییدا بەم ناوەوە کراون . خۆزگەی ئەوەی خواست کە نەکرانایە باشتربوو لەبەر ئەوەی کە هەندێ لە کەسانی نەشارەزاو ناشایستە کردویانە وە بەمە ئالۆزیو گیرەشێوێنییان ناوەتەوە .

ئەمجا هاتە سەر ڕینوسی کوردیو گەشەکردنی . وە وتی زانینی هەردوو ڕێنووس کارێکی گەورەی هەیە بۆ ساغکردنەوەی دەقە کوردییەکان لە دواییدا هاتە سەر باسی ئەو دەوروبەرەی ئەدەبی کلاسیکی کوردی تیا پەیدابوو لەگەڵ پەیوەندی ئەم ئەدەبە بە ئەدەبی میللییەوە ، لە پاشا بە درێژی باسی ئەو مەرجانەی پێویستە بۆ ساغکردنەوەی دەقە ئەدبیە کوردیەکان کرد لەوانە زانینی قۆناغەکانی ڕینوسی کوردیو گەشەکردنی زانینی شێوەکانی زمانی کوردی بە تایبەتی بەشە هونەریەکەیو شارەزابونی ژیانی کۆمەلایەتی کۆچەرو جوتیارەکان ، هەروەها عەروز زانیەو شارەزایی لە هونەری بەلاغەی عەرەبیدا و ئاگاداری زمانە هیندو ئەوروپاییەکان .

دەربارەی تێگەیشتنی دەقە ئەدەبیە کوردیەکان . وتی : پێویستە ئەو کەسەی خۆی بەم مەسەلەیەوە خەریکبکات ئەبێ سەرەرای زانینی ڕینوسی فارسیش ئەبێ ئەفسانەو داستانی میلەتانی ڕۆژهەڵاتی نزیك شارەزابێ وە بە تایبەتیش هەندێ مەعلوماتی ئیسلامی کە ئەدەبی کلاسیکی کوردی ئەیگرێتەوە .

ئەمجا باسی هەندێ کۆسپو تەگەرەی کرد لەوانە . نەزانینی کاتی دانانی ئەو تەسبدەیەو جۆری ژیانی شاعیرەکە .

**ئەمجا چەند پێشنیازێکی کرد لەوانە :**

★ دوو کورسی بۆ وتنەوەی ( گوران ای و ( کرمانجی ) سەروو .

★ لە خوێندنگا تایبەتیەکانماندا کورسی بۆ ئەدەبی کلاسیکی دابنرێ .

★ کۆکردنەوەی دەستنوسەکانمان بە ڕێكوپێکی .

★ دەزگا کوردیەکانیش ڕێگای بلاوکردنەوەی هیچ جۆرە ئەدەبێکی کلاسیکی کورد نەدەن تا بە شایەتی چەند کەسێکی شارەزاو بەراوردکردنی تێکستەکە بە دەستنوسەکە ئەگەنە ئەنجامێکی وا کە باش لێکدراوەتەوە .

★ ئەگەر ئەو تێکستە شایانی ئەوە نەبو بلاوبکرێتەوە لەبەر ساغنەکردنەوەی ئەوا دەزگا کوردییەکان لە ئەرشیفی تایبەتیدا بیپارێزن تا بە تەواوی لە لایەن پسپۆڕێکەوە ساغنەکرێتەوە .

★ لە دوای تەواوبونی باسەکەی مامۆستا محمدی مەلا کەریم بۆ ماوەی سەعاتو نیوێك موناقەشەی لەسەرکرا ئەمەش کورتەیەکی ئەو گفتوگۆیەیە :

**لە سەرەتادا دکتور جەمال رەشید مامۆستای مێژوو لە کولیجی ئەدەبیاتی زانستگای سلێمانی وتی** : زۆر سوپاسی کاك محمد ئەکەم بۆ ئەم وتارە گرنگەی کە چەند خاڵێکی هێنایەوە بیرم ، بە ڕاستی ئەو بابەتەی کە بە ناوی ڕێنوسی کوردی لێیدوا کە وتی : لەوانەیە یەکەم جار بە کوردی ڕێنوسێك پەیدابوبێ وە لە دواییدا فارسەکان وەریانگرتبێ ، دەمەوێ بە کورتی باسی مێژووی ڕینوسێك کە لەم وڵاتانەدا بوە بکەم ، وەکو بلێی فۆرمێکی تایبەتی نەبوە بۆ کۆمەڵێ خەلکی تایبەتی لە شوێنێکی تایبەتیدا ، بەلکو هەر نیشانەیەك مێژوویەکی تایبەتی هەیە کە لە لایەکەوە یان لە وێنەیەکەوە پەیدابوە ، بە ڕاستی پێش پەیدابونی ئایینی ئیسلام نوسینی ئارامی هەبوە ، زۆربەی وڵاتی ڕۆژهەڵاتی ئاسیای بچوك [ واتە تورکیای ئێستا ] وە عیراق ، سوریا ، ئیران بە گشتی بە خەتی ئارامی نوسیویانە بێجگە لە دەوڵەتی بیزەنتە کە بە خەتی لاتینی نوسیویەتی ، هەروەها ئەو ناوچانەی کە کوردی تیابوە بە تایبەتی ولایەتی کوردوین کە دیاربەکری ئەمرۆیە بە خەتی لاتینی نوسیویانە ، بەلام کە ئایینی ئیسلام پەیدابوو خەتی عەرەبی بو بە خەتێکی پیرۆز ، ئەگەر زیاتر بچینە دواوە لەوانەیە دەقی وابیبنین کە زۆر کۆنەو ئەگەرێنەوە بۆ ١٦٠٠ ساڵ پێش زایین ، وە هەر چەندە حەرفەکان بزمارین بەڵام نزیکی کوردین ، مەبەسیشم نوسینەکەی ( کەیکولی )یە خەلکی شاری واشوکالی بوە کە کەس هەولی دۆزینەوەی شارەکەی نەداوە لە پاشان بەرێز دکتور جەمال تێرو تەسەل باسی ئەو دەستنوسانەیکرد کە دۆزراونەتەوەو لە کتێبخانەو مۆزەخانەکانی وڵاتانی جیهانا پارێزراون .

هەروەها باسی دەستنوسێکی کرد کە لە هەورامان دۆزراوەتەوە هەرچەندە ئارامییە بەڵام ئەتوانین بلێین کوردییە .

ئەمجا دكتور پشتگیری مامۆستا محمدی کرد ، دەربارەی شارەزایونی شوێنی جوغرافی بۆ دۆزینەوەو بەراوردکردنی دەستنوسەکان لە دوای ئەویش رۆشنبیری لاو کاك بارزان عەلی مەسەلەیەکی گرنگی وروزاند دەربارەی ساغنەکردنەوەی هەندێ شیعر کە بە ناوی چەند شاعیریکەوە چاپکراوە . لە دیوانی ئەمیانا هەیەو لە دیوانی شاعیرێکی تریشا تازەبۆتەوە ، وە بۆ ئەم مەسەلەیەش نموونەی هێنایەوە ئەمجا مامۆستا رەئوف ئالانی دەربارەی کۆکردنەوەی سامانو کەلەپوری نەتەوەییمان دوا . پەنجەشی بۆ هەوڵو تەقەللای کۆڕی زانیاری کورد راکێشا دەربارەی

بایەخدانی بە کۆکردنەوەو پاراستنو چاپکردنی ئەم سامانە بە نرخەمان .

هەروەها داوای ئەوەشی کرد : کە گرنگ هەر خەرمان هەلگرتن نیە بەلکو شەنو کەوی ئەوێ جا بۆیە پێویستە سوود لە لایەنی زاراوەشو لایەنی زمانەوانیش لە دەقی دەستنوسەکان وەربگرین .

**دوای ئەویش مامۆستا کەمال میراودەلی :**

رێزو نوازشی پێشکەش بەو بەرێزانەی دەستپێشکەرییان لەم بوارەدابوە کرد ، وەك کوردیو مەریوانیو حوزنیو گیوی موکریانیو مەلا عەبدولکەریمی مودریسو کوڕەکانی لە پاشان مامۆستا ئەژی گۆران پرسی : ئایا ئێمە لەم دیدارەدا گەیشتینە چ ئەنجامێك ؟ وە لە دوایدا پێشنیازیکرد کە ئەم دیدارە دەبێ دیدارێکیتری بە دوادا بێ .

هەروەها وتی : پێویستە مێژوونوسی وامان بێ کە شارەزای کارتێکردنی ئەدەبی دراوسێ بۆ سەر ئەدەبی کلاسیکی کوردێ هەروەها شارەزایی لە کلاسی ئەوروپاو دەولەتە دراوسێکان ، جگە لەوەی پێویستمان بە پسپۆڕی زمانو عەروزو لایەنە هونەریو جوانناسی هەیە .

وە لە کۆتایدا سوپاسی مامۆستا محمدی مەلا کەریمی کرد بۆ باسەکەی و بۆ پێشنیازە بەنرخەکانی .

**ئەمجا مامۆستا حەسیب قەرەداخی** دەربارەی کۆکردنەوەو پاراستنی کەلەپورمان دوا ، وە وتی : خۆزگە کاکە حەمە داوای لە هەموو روشنبیرێ بکردایە کە لەم بوارەدا کەمتەرخەمی نەکەن .

هەروەها باسی ئەو دیاردەیەشی کرد کە کاك بارزان عەلی لێیدوا دەربارەی دوبات کردنەوەی شیعری شاعیریك بە ناوی شاعیرێکیترەوە هەروەها لایەنگیری پێشنیازەکانی مامۆستا محمدی مەلا کەریمی کرد .

ئەمجا مامۆستا محمد امین هەورامانی دەربارەی پێشنیازو گلەییەکەی مامۆستا ئەژی گۆران وتی : ئێمە چەند مانگێك ، بگرە سالێك لەمەوبەر داوامان لە نوسەرو شارەزایانکرد کە بۆ ئەم دیدارە باسمان بۆ بنوسن ، بەلام لە راستیدا وتارەکان ئەوەندە کەمبو نەمانتوانی بکەوینە بەراوردکردن ، ئەگەرچی ئێمە لە سەرەتاشا نیازمان وابو کە بیرەوەری شاعیرانمان بکەینەوە لە ئەنجاما کردمان بەم دیدارەی کە دەرگایەکی تازەی بۆ گەلی لێکۆلینەوە خستە سەر پشت .

**ئەمجا مامۆستا کەریمی زەند** داوای کرد کە پێویستە هانی ئەو کەسانە بدرێ کە بە دوای کەلەپورو میراتی نەتەوەکەمانا دەگەڕێن ، وە پێویستە هیچ کامێکمان لەم روەوە کەمتەرخەمی نەکەین ، هەروەها دەربارەی زمانو رێنوسی کوردیو رای مینوردسکی لەم روەوە دوا .

**دوا بە دوای مامۆستا زەند مامۆستا کەریم** شارەزا وتی : لە وتارێکمدا دیوانی شاعیریکی کلاسیکیم هەلسەنگاندوە ، لەو وتارەدا پێشەکیەکەم نوسیوە کە زۆر لایەنی لەگەل باسەکەی کاك محمد یەکدەگرنەوە ، بە تایبەتی دەربارەی رێنوسی کۆنو ساغ کردنەوەی ، وە دەربارەی ئەو مەرجانەی کە دەبێ لە لێکۆلەرەوەکاندا بێ بۆ ساغکردنەوەی دەستنوسەکان .

هەروەها دەربارەی نازناویش وتی : من ئەم وتوە کە نازناو سوودی نیە ئەمجا نموونەیەکی لە شیعرێ هێنایەوە کە لە گۆڤاری کولیجی ئەدەبیاتا بەشیعری سالم دانراوە لە راستیشدا ئەو شیعرە هی حاجی قادری کۆیە هەروەها دەربارەی بە هەلەچوونی باحثێکی تریش کە شیعرێکی مەحوی بە شیعری شێخ رەزا داناوە ، بە درێژی دواو روونیکردەوە .

**ئەمجا مامۆستا ئەحمەد هەردی وتی :** بەراستی زۆر شت بە خەیالما هات بەلام لەبەر بێ تجملی خەلکەکە باسمنەکرد ، جا با بێینە سەر ئەم باسەی مامۆستا من لام وابێ ئەم باسە

درێژەپێدانی باسێکی تری لەوەوپێشی بێ ، لێرەدا مەبەس لێکۆڵینەوەو دۆزینەوەو زیندوو کردنەوەی سامانی نەتەوەییمانە بێ گوێدانە چاکیو خراپی ، لە پلەی دوەما خەڵکیتر دێن تحقیقاتی ئەکەن ، تەنانەت لە کاغەزو لەمەرەکەبەش ئەکۆڵنەوە تا ئەگەنە ئەنجامێك .

ئەمجا زمانەوانەکانیش رۆڵی خۆیان لەم ساغکردنەوەیەدا دەبینن لە پاشا وتی : کاکە حەمە ئیشارەتی کرد بۆ ئەوەی کە ئێمە شتئەگۆڕین من لاموایە هەندێ جار شاعیرەکان خۆیان لە ژیانی خۆیانا بە قەڵەمی خۆیان شتی خۆیان ئەگۆڕن ، بەڵام ئەمە جیایە لەگەڵ ئەوەی کە یەکێك دێو بە ئارەزوی خۆی دەستکاری بەرهەمی خەڵکی ئەکا یان لەوانەیە عەروز زانێك هەر لەبەر ئەوەی بە پێی کێشی عەروز لە شیعرێ نا قایلبوە دەستکاریکردوە ، ئەمانە کاکە حەمە هەموی باسکردن ، لە پاشا ماموستا هەردی باسی گۆڕینی هەندێ شیعری لە گۆرانی هونەرمەندەکانا کرد .

هەروەها دەربارەی ئەو دیاردەیەش دوا کە شیعری شاعیرێك بە ناوی چەند شاعیریکەوە بڵاوئەبێتەوە ، وە ئەو رێگایانەی بۆ ساغکردنەوەی ئەم مەبەسە دەستئەدا دەستنیشانکرد .

هەروەها باسی بەکارهێنانی هەندی وشەی کرد کە لە شیعری نالیدا هەیە وە وتی ئەمە پەیوەندی بە وەزنەوە هەیە .

ئەمجا وتی : نالی هەڵگری ئاڵای زمانی نەدەبیبوە ، کە واتە ئەو زمانەی ئەو بەکاری هێناوە ئەوە سەرچاوەیە .

بۆ ئەمەش باسی شیعری عەرەبی بە تایبەتی شیعری جاهیلیکرد دوای ئەویش کاك ئومید کاکە رەش دەربارەی دوبارەکردنەوەی ئازناو دوا لەوانەش ناوی ( بیوەی ) بە نمونە هێنایەوە .

**ئەمجا ماموستا شێخ ئەمینی نەقشبەندی ( بیوەی ) وەڵامی دایەوەو وتی :**

من لە کۆتایی چلەکانەوە هاورێکانم بە ( بیوەی ) بانگیان ئەکردم وە تەنانەت کوڕەکەشم ناو ناوە ( بیوەی ) .

ئەمجا هاتە سەر باسی سۆفیتیو بە کورتی لەم لایەنە دواو هەندێ لە ڕاکانی برادەرانی پێشووی شیکردەوە .

وە وتی : برادەران میراودەلی : محمەدی مەلا کەریم کەمێ توند رویشتوونو کە سوفیتی چارەسەری گیروگرفتی کۆمەڵ ناکات .

باسی پەیدابونی سوفیتیو سەرچاوەکەی کرد کە لە ئەنجامی ئازاردانو چەوسانەوەوە پەیدابوە ـ بە تایبەتی بە رای هەندێ لە رۆژهەڵاتناسەکان ـ باسی هەللاجو شێخ عمری سهروەردی کردو وتی : هەر لەم دیدارەدا گیانی ئەوانە پاڵیان پێوە ئەنام بەرگرییان لێبکەم بەڵام من لەسەرەتاوە بڕیارم دابو لەم دیدارەدا نەدوێم تا وا لە قەڵەمنەدرێ ادعای شارەزایی ئەکەم بەڵام وا کاك ئومێد ناچاریکردم بێمە پشت مایکرۆفونو بەو بۆنەیە شەوە ئەم چەند قسەیە بکەم ، هەروەها باسی نجم الدینی کوبراو تەریقەکەی کرد کە لە کاتی حەملەیەکی داگیرکەرانا پشتی خەڵکەکەی بەرنەداو لە ناویانا مایەوە بۆ بەرگریکردن لە خەڵکەکە ، ئەمجا باسی کوشتنی شێخ عمری سهروەردی کرد کە چۆن تا دوا هەناسەی لەسەر بیرەکەی خۆی سەباتی هەبوو .

ئەمجا کۆتایی بە دوا کۆڕی ئەم دیدارە هێنرا .

* * *

**لە کۆتایی دیدارەکەشدا ماموستا محمد امین هەورامانی** وتاری بنەماڵەی دەزگاری رۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی بە ناوی وتاری ماڵئاواییەوە پێشکەشکرد ، دوای ئەو ماموستا عەبدوللا عەباس کۆتایی بە دیدارەکە هێنا بە هیوای بە یەك گەیشتنیتر لە رۆژانی داهاتودا بەم شێوەیە ئەدیبانو رۆشنبیران هۆڵی فارابییان بەجێ هێشت کە تا هاتنە دەرەوەیان ، هەر لەو بڕوایەدابوون کە لە ژێر رەشماڵەکەی نالیو سالمو کوردیدان .

وا ئەم دیدارەش کۆتایی هات ... ئاواتمان ئەوەیەکە ئەوەندە نەخایەنێ لە دیدارێکی دیدا بە یەك بگەینەوە .

**سلێمانی : نیسانی ۱۹۸۱**

* * *

**تێبینییەك :**

لە نوسینی روداوەکانی ئەم دیدارە ، شێوەی وەرگرتنی پوختە باسو گفتوگۆکانم بەکارهێنا ، واتە ئەوەندەی لە کاتی دانیشتنەکاندا فریا ئەکەوتم ، جا ئەگەر هەندێ ئاڵوگۆڕ لە رای برادەرانا هەبێ بە هیچ مەبەسێ نیە تەنیا ئەوە نەبێ کە هەوڵم داوە پوختەی وشەکانیان پیشانبدەم نەك دەقی ئەو شتانەی وتویانە ، جا ئەگەر لەم رووەوە کەموکوڕییەك هەبێ داوای لێبوردن ئەکەم .

**مستەفا**

